# چیرۆکی قەدەر

ڤۆلتێر (فرانسوا ماری ئارویە)

و: حەمەکەریم هەورامی



# چیرۆکی قەدەر

نووسینی

ڤۆڵتێر

وەرگێڕانی

حەمەکەریم هەورامی





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

# ● چیرۆکی قەدەر

● نووسینی: ڤۆڵتێر
● وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: حەمەکەریم هەورامی
● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
● بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
● نرخ: ٣٠٠٠ دینار
● چاپی یەکەم ٢٠١١
● تیراژ: ١٠٠٠ دانە
● چاپ: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)
● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٩٢) ی ساڵی (٢٠١١) پێی دراوە.

زنجیرەی کتێب (٥٢٤)

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەرۆك

## چەند وتەیەك دەربارەی ئەم چیرۆکە:

* لە ساڵی (١٩٦١)دا لەقاهیرە قوتابی کۆلیژ بووم، لەو ساڵەدا نازانم چۆن چیرۆکی (القدر)ی (ڤۆلتێر – ١٦٩٤-١٧٧٨) کە (د. طه حسین) نووسەری گەورەی عەرەب کردبووی بە عەرەبی کەوتە بەر دەستم، دوای خوێندنەوەیەکی چڕ گیرۆدەی بووم، لەناخەوە دەرگای رووناکی لەسەر گەشەکردنی هەست و چێژەکانی کردەوە، وای لێکردم وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی.

کە گەڕامەوە کوردستان، بەو نیازەوە رێگەیەك بۆ چاپکردنی دەستنووسەکەی بدۆزمەوە، چووم بۆلای مامۆستا گیوی موکریانی، کە خۆم پێی ناساند و باسی کارەکەی خۆمم بۆ کرد بەخۆم و بەکارەکەم گەشایەوە و ئافەرینی لێ کردم، پێی وتم: وابزانم ئەو چیرۆکە (محەمەد عەلی کوردی)یش هەر لەو ساڵانەدا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کە وای وت وەکو ئاو بەسەر ئاگردا بکەی تەزوێکی سارد بە لەشمدا هات.

گەلێ هەوڵم دا دانەیەك لە وەرگێڕانەکەی ئەو دەست بخەم تا لەتەك وەرگێڕانەکەی خۆمدا بەراوردی بکەم، بۆ ئەوەی بزانم من لەکوێم و ئەو لەکوێیە، بەڵام هەوڵەکەم بێ سوود بوو هەتا ئێستاش هەر بەرچاوم نەکەوت، ئەوە وای لێ کردم هەوڵ بۆ لە چاپدانی نەدەم و پیشانی کەسیشی نەدەم.

دەستنووسەکەم لای خۆم پاراست، لەسەرەتای ئەمساڵدا کە لە نووسینی: (بەرگی دووەمی زانستی کەلام) بوومەوە، بڕیارم دا تاڵە چاپدانی دەبەوە پشوو بەخۆم بدەم، کەچی لە پڕ دەستنووسەکە هاتەوە یادم و خۆی بەسەرمدا سەپاند و نەیهێشت پشووەکە بدەم، کە هێنامەوە بەردەستم ماوەی ئەو (٤٩) ساڵەی لەو ساوە تا ئێستام وەك نێوان دوو چرکە ساتی هەناسەیەك هاتە بەرچاو، یان بەجۆرێکی دیکە بڵێم ئەو هەموو ماوەیەم وەك ماوەی دوو چاوترووکاندن هاتە پێش چاو.

بە وەرگێڕانەکەی ئەوسامدا چوومەوە، ئەو جۆرە رێنووسەی ئەوسام کرد بەم جۆرەی ئێستا، ئەم جارەیان توانیم لەو شێوازە رەوان و کورتبڕەی (طه حسین) نزیك

ببمەوە، دیارە ناوبراو بیروڕا فەلسەفییەکانی ڤۆلتێری لـە قـاڵبێکی عـەرەبی سـافدا دارشتبوون، منیش هەوڵم دا لە دەربڕینـدا زمـان و شـێوەی وەرگێڕانـە کوردییەکـە ببەمە ریزی شێوازە عەرەبییەکـە، جـا نـازانم تـا چـەند توانیومـە وابکـەم، ئەگـەر نەمتوانیبێ خەتا لەمنە نەك لەزمان.

* ئەوەی منی هەڵنا بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکە بکەم بەکوردی رەنگە چـەند هۆیـەك بووبن بەسەر هەموویانەوەی ئـەو فـەزا و کـەش و هەوایـە بـووبێ کـە سـەیوانێکی رۆژهەلاّتییانەی رۆمانسی بۆ هەموو نەژاد و لایەنەکانی چیرۆکەکە هەڵداوە بەتایبەتی رەنگدانەوەی وڵاتی کوردان و ئەو سرووت و پەندە پـڕ حیکمەتانـە کـە بەشـێکن لـە فەرموودەکانی زەردەشت.

هەر چەند سەنتەری زەمینەکەی شاری بابلی دووهەزار ساڵی بەر لەزانینە، ئەوەی فـەزای چـیرۆکەکەی فرەتـر خـەیالاّوی کـردووە تـەنینی تـان و پۆکەیـەتی بـەداوە رەنگینەکانی بە یەکێك لە چیرۆکەکانی هەزار و یەکشەوە، ئەوشتانە هەموو کراون بە بازیبەندێکی پڕ بەها و گەردانەی زێڕین لە قۆڵ و گەردنی خۆشەویـستی راسـتەقینە کراون.

پێ دەچێ لەپاڵ ئەو هۆیانەشدا هۆیەکی دیکـەش کـاری خـۆی کردبـێ کـەبوونی یەکێك لەو دوو دڵدارە سـەرەکییەی نـاو چـیرۆکەکەبێ، کـە ئـەو شـاژنەیە کـەناوی (ئەستارتیە)یە، دوورنییە ئەو شاژنە بابلە ئەو شاژنە نەبێ کـە شـای بابـل باخـچەی هەڵواسراوی بۆ دروستکرد، کە ناوی (ستارە) بووە، وەکو مێژوونووسـان بـۆی دەچـن خەڵکی ناو شاخ و چیاکانی کوردستان بووە.

* مەملەکەتی ئەم چیرۆکە چەندین ئافرەتی تیایە، کە هەموویان لە بارەی بیروڕا و پەیوەندی بوونیان بە داب و نەریتەوە و رەوشتیان بیری خوێنەر بەلای ئەوەدا دەبـەن کە ڤۆلتێر گومانی لە توانای ئافرەتدا هەبووە، لـەوەدا مەبەسـتی بـووە بڵـێ ئەمـە حەقیقەتی ئافرەتە و فەرموو ئێوەش حوکمی خۆتان بـدەن ئەگـەر وانییـە ئـەی ئـەو

هەموو نموونەی هەمە جۆرەی ئافرەتانە چین کە زیاتر لە نیوەی رووبەری چیرۆکەکەیان داپۆشیوە؟

ڤۆلتێر جگە لەوەی چەندین جۆری ئافرەت دەکات بە نموونەی بۆچوونەکانی خۆی لەو بارەوە، ئەو رایەش بە ئاشکرا سەبارەت بە پرسی (قەزا و قەدەر) دەردەبڕێ: گوایە مرۆڤ و هەموو زیندەوەرە و نازیندەوەرێك لە ژێر باری توانایەکی گەورەی بێ بەزەییدان، وازی بەبوون و چارەنووسیان دەکات بە تایبەتی چارەنووسی مرۆڤ، گوێ ناداتە حەز و ئارەزووەکانی و ئەویش دەسەلاتی دەرچوونی لە سایەیدا نییە.

چۆن قەزا بریاری داوە و قەدەر چۆنی ویستووە هەڵیدەسوڕێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ڤۆلتێر داوا لە مرۆڤ دەکات لە خۆی و لە ویستی خۆی دەست بەردار نەبێ و کۆڵ نەداو هەوڵ بدا قەدەر بەلای ویست و ئارەزووی خۆیدا وەرچەرخێنێ.

* لە هەندێ گۆشەی چیرۆکەکەدا ڤۆلتێر جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە عەقل و هۆشیاری هۆی سەرەکی نەهامەتی و کلۆڵی مرۆڤن.

لای وایە: شەڕ تا سەر شەڕ نییە لەناوکرۆکیدا خەیرخۆی حەشارداوە بەختیاریش تا سەر بەردەوام نابێ، لەناویدا تۆوی دەردەسەری و ناخۆشی و شەڕی تیاچێنراوە، ئەرکی مرۆڤ لە هەردوو حاڵەتدا هەوڵدان و کۆڵ نەدانە، بە هەوڵدان و کۆڵ نەدان مرۆڤ (بوونی خۆی) دەسەلمێنێ، یان دووپاتی دەکاتەوە، کەخاوەن ویست و دەسەلاتە.

*وەك دەردەکەوێ ئەم چیرۆکە بۆگەلێ زمانی جۆراوجۆر وەرگێردراوە، جارێ بەناوی (زەدیج) کە پاڵەوانی سەرەکی چیرۆکەکەیە، جارێکی دیکە بەناوی (القدر)وە، وەك (طه حسین) بەو ناوەوە کردوویەتی بە عەرەبی.

# کوێر

زەدیج: هەتابڵێی گەنجێکی هەڵکەوتە و هۆشیار بوو، کـەم ڕەوشـت پـاکی وەهـا هەبوون، لەسەردەمی یەکێك لە پاشاکانی بابلدا دەژیا کەناوی (مۆبـەدار) بـوو، لـەو سەردەمەدا ئەو لە هەرەتی گەنجیدا بوو، وا پەروەردە ببوو تافی لاویەتی نەیتوانی بوو لغاو بە ئارەزووەکانی شل بکات، بۆیە بە ئاسانی دەیتوانی هەوەسـە دەروونییـەکانی جەڵەو بکات، وەکو خەڵکی ئەوکاتە خۆی هەڵ نەدەنا و، نەیدەویست لەبڕیارداندا دوا بڕیـار بـۆ ئـەو بـێ، بـە ئاسـانی شـتی دەنرخانـد و لایەنـە لاوازەکـانی مرۆڤـی هەڵدەسەنگاندن.

ئەوانەی ئەویان دەناسی سەریان لێی سوڕمابوو، دەیـان وت (ئـەوە بـۆزەدیج لـە هەموو کەسێ هۆشیار و زیرەکترە کەچی ئەو هەموو مشتومڕە ئـەو هـەموو ژاوەژاوە بێسەروبەرانە، ئەو هەموو شتە نهێنییە گەمژە و بێ مانایانە، ئـەو هـەموو بڕیـارە کاڵ و نەگرساوانە، یان لەوهەموو شتە دارێژراوە پووچەلانە، ئـەو هـەموو فـەرمان و فەرمووده گەوجانە بێدەنگە، ئەو هەموو شتانە بە بەرچاویدا دێن و تێپەڕدەبن کەچی چاویان لێ دەپۆشێ و چارەسەرێکیان بۆ نادۆزێتەوە).

ئەو گاتای یەکەمی کتێبەکەی زەردەشت وای فێر کردبوو کە: (ئەوەی خـۆی فـش بکاتەوە لە هەمانەیەکی فوودراو دەچێ لـە کونەکانیـەوە گێـچە لووکـەی هـەڵاودەر دەچێ)، لەبەرئەوە زەدیج چوون خەڵکی دیکە هـەرگیز گاڵتـەی بـە ژنـان نـەدەکرد، هەرگیزیش بەچاوێکی سووك تەماشای نەدەکردن، چەندی بیری لێ بکەیتەوە دە هەندە جوامێر بوو، بە چاکەکردن بەوانەی کە سپڵەن دلگران نەدەبوو، ئـەو لـە یـەکێك لـە ڕێنماییەکانی زەردەشت پێغەمبەرەوە ئەو پەندەی وەرگرتبوو، کە دەڵێ (کە خواردنت خوارد بەشی سەگیشی لێ بدە با ئەو سەگەش هار و لاگیر بێ).

زەدیج پیاوێکی زانا و فەیلەسوف بوو، هەمیشە لەناو جڤاتی زانایاندا دەبینرا، لە زانینی پێشینانی کلدانییەکاندا شارەزابوو، لە بنەما سرۆشتیەکانیشدا ئاگاداربوو، ئەو بنەمایانە لەو سەردەمەدا زانینیان باوبوو، ئەو شتانەش کە لە دەرەوەی سروشتدا هەبوون وەك خەڵك دەیزانین و لێیان بێ ئاگا نەبوو.

هەرچەند لەو کاتەی ئەودا بۆچوونێکی تر هەبوو، ئەو لەوە دڵنیابوو کە ساڵ لە سێسەدو شەست و پێنج رۆژ و چارەك رۆژێك پێك دەهات خۆریش بنکەی گەردوونە.

سەبارەت بەو تۆمەتانە کە سەرۆکی کاهێنەکان دەیدانە پاڵ زەدیج ئەو لایەنی بێدەنگی دەگرت و تووڕە نەدەبوو، گاڵتەیشی بە پووچەڵیٔ ئەو تۆمەتانە نەدەکرد.

تۆمەتەکان ئەمانەبوون (گوایا زەدیج بیروڕای خراپی هەیە، دەخوازێ لە رێنماییەکانی دەوڵەت دەرچێ، دەیەوێ بڕوا بە خەڵك بینێ کە خۆر بە دەوری خۆیدا دەسورێتەوە، یان ساڵ لە دوانزە مانگ پێکهاتووە).

زەدیج لە ژیانی خۆی دڵنیابوو کە بەختیارە چونکە خاوەن سامانێکی فراوان بوو لەبەر ئەوە گەلێ برادەری لەدەور خۆی کۆکردبوونەوە، لە تەندروستیدا لاشە ساغ و پالەوانانە هەڵکەوتبوو، نێو نیگای وەکو مانگی تابان تریفەی دەدا، چاوەکانی دەریایەکی پڕ لە نهێنی بوون، ژیر و راستگۆ و سروشت رەوان و سنگ فراوان و رەوشت راست و جوامێر بوو، بە بەژن و باڵا و شۆخ و شەنگ بوو، میزاج رەوان و هێمن و لەسەرخۆ بوو، دەروون پاك و هێژا بوو.

دڵی چوو بووە (پەریزاد) ناوێك، لەناو ئەو نەمامانەی بابلدا جەمین جامانێك بوو، نەسڵزادییەکەی و فرەسامانییەکەی جوانییەکەی رازاندبووەوە زەدیج بەڕاستی دڵی خۆی دابوویە، ئەویش شەیدای ئەو بوو، ئەڤینداریەکەیان لە رادەبەدەر بوو، ئەوەندەی نەمابوو بگەنە ئەو ساتەی کە بەیەك شادبن، رۆژێك بەیەکەوە بۆ پیاسە چووبوونە دەرەوەی شار، لەناو گوڵزاری ئەو ناوەدا، لەژێرسێبەری دارخورماکاندا، ئەو دارخورمایانە کە دیمەنیان لەتەك وردە شەپۆلەکانی رووباری فوراتدا یاریان دەکرد، لەناو ئەو دیمەنە ئەفسوناوییەی کەناری فوراتدا هەریەك سۆزی دەروونی خۆی بۆ

ئـەویتر دەردەبـڕی. پـەریزاد نامـەی ئـەڤینی خـۆی لەسـەرپەرەی ئـەویلێ زەدیجـدا دەخوێندەوە، زەدیجیش نامەی جوانی گەردوونی لەبالآی پـەریزادا وێنـا دەکـرد، لـەو کاتەدا شنەبا دەهات بۆنەوەی گەلآی درەختەکان بۆ سڕینی ئـارەقی سـەرگۆنای ئـەو دوو دڵدارە بشەکێنێتەوە، سروشت دیمەنیکی پڕ لە ئارام و جوانی بۆئـەو دوو دڵـدارە سازدابوو، لەوکاتەدا چەرخی چەپگەڕ نێردی وەشاند و ناشـوبی گێـرا، لـە پـڕ چـەند زەلامێکی شیروتیر بەدەستیان لێ راپەڕین، چەند کەسانێکی نزیکی ئەو گەنجـە بـوون کە ناوی (ئۆرگان) بوو، ئەویش خۆی بە خزمی وەزیرێـك دەزانـی، بۆیـە لای وابـوو، هەرچی بەو دوو دڵدارە بکات بۆی رەوایە.

ئەو (ئۆرگان)ە لە کەسیەتی و رەوشتدا گەلێ لە زەدیجـەوە دوور بـوو، گـەنجێکی پشی تەنگ و تووڕە و دەروون تەسك و بێ وەج بوو، گەلێ بەخۆی دەنازی، خـۆی بـە زەدیج نەدەگۆڕییەوە، ئیرەتی سەبارەت بە پەریزاد کوێری کردبوو، کە چـاوی بـەو دوو دڵدارە کەوت بەرچاوی تاریك بوو، سنگی پڕبوو لە کینەوقین، ئۆرگان و چەکدارەکانی پەریزادیان لە زەدیـج دابـڕی، لـە ئـەنجامی بەرەنگاربوونـەوەدا روومـەت و لاشـەی بریندراربوون، ئەو دیمەنی رفاندن و بریندراربوونەی بەردی دەتوانـدەوە، قیـژە و هـاواری فرمێسکی لەچاو پڵنگەکانی ئەو ناوەدا دەهێنایە خوارەوە، هاواری دەکرد و دەیـووت (هۆمێردە خۆشەویـستەکەم هۆ زەدیج گیان، کێ دەتوانێ خۆشەویـستی تـۆ لـە دڵمـدا دەربێنێ.)

پـەریزاد گـوێی لـەوە نـەبوو چـی بەسـەرهاتووە و چـۆن لـەژێرپێی ولاغـەکانی (ئۆرگان)دا لەشی بریندارکراوە، چونکە لەبەر دڵی ئاگای لە خۆی نەمابوو دڵی وەکـو دەهۆڵ لە سنگی دەدا و هەر زەدیج زەدیجی بوو، کـەدی وا خۆشەویـستەکەی لەسـەر سەری راوەستاوە و ماوە هەندێ لێی ورد بووەوە و هێنای هـەڵهێنا و وتـی: (زەدیـج یاری خۆشەویستم، ئەی ئارامی دڵ وگیانم، تائێستا خۆشەویـستی تـۆ بـۆ هاوسـەری بوو، لەمەودوا دڵم مەڵبەندی دڵی تۆیە، گیانم هێلانەی ژیان و ئابڕووتە).

دڵ نەبوو لەکەف وکوڵ و دەربڕینی سۆزدا بگاتـە دڵـی پـەریزاد، کـە دی زەدیـج لەدەست ئەو چەتانە رزگاری بووە، ئەوەندەی تر دڵی کەوتە جۆش و خرۆش، نای ئەوە چ تاسەیەکی ئەفسوناوی بوو بـە دەربڕینـی وشـەکانی نـاوزاری مـەوجی دەدا، ئـەوە وەشتی ئەو نەڤینەبوو کەلە ناسۆی بەیاندا ناخی سروشتی ناوێزان و پڕلە مانا دەکرد، نەزاکەتێ بوو منەتباری بۆئەو رزگاربوونـەی زەدیجـە دەردەبـڕی. هەرچـەند بـەدەنی ناسکی پەریزاد بە راکێشانی بەناودڕك و بەردی ئەوناوە داروشکابوو کەچی زامەکانی زەدیج چنگیان لـەقوولایی لەشـی گیرکردبـوو، دوعـاو نـزای شـەو و رۆژی پـەریزاد لەخواکان ئەوەبوو کە زەدیجی بۆ رزگاربکەن و برینەکانی بۆ ساڕێژ بکـەن، هەمیـشە بیری لەو رۆژە دەکردەوە کە خۆشەویستەکەی زەدیج چاك ببێتەوە.

پەریزاد جوانی خۆی لەناو چاوەکانی زەدیج دا مـشتومالڵ دەدا، بـەلام رۆژ بـەرۆژ ئومێدی چاکبوونەوەی زەدیجی لا کەم دەبـووەوە، دیتنەکـەی لـەناو چـاوەکانیدا لێـل دەبـوو، رۆژ دوای رۆژ دەرژایـە نـاو چـاوەکانیەوە، تانـەی چـاوی رێگـەی خـۆدیتنی پەریزادی پڕ لە تەمومژ دەکرد، تانەکە هەرەشـەی کوژاندنـەوەی روونـاکی ناودیـدی زەدیجی دەگەیاند بەرەو کوژاندنەوە دەچێ، ناردیـان بەشـوێن ئـەو پزیـشکە نـاودارە میسرییەدا کە لەشاری (مەمفیس) دادەنیشت کە ناوی (هەرمیس) بـوو، بـەخۆی و دەست و پەیوەندێکی زۆرەوە گەیشت، پشکنینی بۆ نەخۆشییەکەی زەدیج کرد، پـاش پشکنینەکە سەری مەخابنی لەقاند و هەناسـەیەکی قـووڵی پڕیـەداخی هەلکێـشا و وتی: (ئەو چاوە چارەی نەماوە و لەدەست چووە، ئەگەر چاوی راستی بوایە لەوانـەبوو چارەبکرایە، بەلام چاوی چەپ چارەی نییە!. نقلانە لێدانی ئەو پزیشکە سەبارەت بـە چاك نەبوونەوەی چاوی زەدیج ولاتی بابلی لەبەرچاو مەردومەکـەی تاریـك کـرد، لـە هەمان کاتدا خەلکەکە لەوە سەریان سورمابوو کـە چـۆن (هـەرمیس) بـەو هـەموو زانینەوە نەیتوانی ئەوچاوە چاك بکاتەوە، لەهەموو دونیای ئەو کاتەدا پزیـشکی وەك خۆی نەبوو هەرقەیرانێکی دابنایە بەراست دەردەچوو، لەمەوە هـەموو خـەلکی بابـل بۆنەمانی ئەو چاوەی زەدیج خەمباربوون، کەچی دوورۆژی نەخایاند ئەو دۆمەڵەی کـە

لەقەراخ چاوی زەدیج دەرهاتبوو لەخۆیەوە تەقی و کێمێکی زۆری لێ هاتە دەرەوە، دوای ماوەیەکی کەم زەدیج ئێشەکەی سرەوت و چاك بووەوە .

کە (هەرمیس) زانی قەیرانەکەی بەڕاست دەرنەچوو لە شەرمەزاریدا کتێبێکی دانا بە ناونیشانی (چاوی زەدیج مافی چاك بوونەوەی نەبوو).

زەدیج کە چاوی چاك بووەوە خۆی ئامادەکرد بچێت بۆلای خۆشەویستەکەی پەریزاد بۆئەوەی بەیەك شاد ببنەوە و وەکو جاران هەریەك لەناو دیدی ئەوی دیکەدا خۆی بەدی بکات. کەچی پەریزاد سێ ڕۆژ بەرلەوەی مەترسی لەچاوی زەیج بکرێ، بەرلەوەی نقلانەکەی (هەرمیس) ببیسێ گەرابووەوە بۆ دەڤەرەکەی خۆی، بەو بیانووەی کە (حەزی لە پیاوی چاوکوێر نییە) هەر ئەوشەوە خۆی لە (ئۆرگان) مارە کردبوو. لەنیوەی ڕێدا زەدیج کە ئەو هەواڵەی زانی بێهۆش کەوت ورما، خەریك بوو داخی ئەو بێوەفاییەی پەریزاد بەرەو ڕۆخی گۆڕی ببا ئێشی ئەو ڕووداوە گرانە چاوەکەی هێنایەوە سوو، بەلاّم ژیری لە ئێشی دابران بالاترە، کە بەناگا هاتەوە لەبەرخۆیەوە وتی: (ئەمە جارێ تاقیکردنەوەی کچانی ناو تەلار و کۆشکم بۆ دەرکەوت، کەوابوو لەمەودوا هاوسەری لەگەڵ کچێکدا دەکەم لە چینی بۆرەبێ) .

(ئەزۆرا) کچێك بوو گەلێ بە نازداری و نیانی پەروەردە کرابوو یەکێك لە کچە کارزان و جوانەکانی ناوشاری بابل بوو، زەدیج کردی بە هاوسەری خۆی و مانگێك پێکەوە ژیان.

(ئەزۆرا) گەلی بەسۆز و ناسك بوو، بەلاّم بڕوایەکی بە تینی بە ئەفسانە و شتی پروپووچ هەبوو، باوەڕێکی نەگۆڕی چەسپاوی بەوە هەبوو: کە ئەوانەی جوانییان تیا بەدی بکرێ ئەوانەن کە پایەدار و بلیمەتن) .

❊ ❊ ❊

# لووت

(ئەزۆرا) بۆ سەردانی خزمانی بۆ دەرەوەی بابل چووبوو، کە گەرایەوە ئەوەندە تووڕە و پەست بوو، نێو نیگای خۆی کرژ کردبوو، زەدیج کە (ئەزۆرا)ی دی وا کرژ و پەستە، بە نەرم و نیانییەوە لێی چووە پێشەوە و وتی: (هاوسەری نازیزم چی قەوماوە وا بەکرژ و پەست دێیتە بەرچاوم)·

(ئەزۆرا) هەناسەیەکی پڕبەکەسەری هەڵکێشا و وتی: ئەوەی من دیومە تۆش بتدیایە لە ڤینا لە پێستی خۆت دەردەچووی، چۆن بەرد ناباریێ و دونیا کاول نابێ، ئەمڕۆ بۆ پرسەی ئەو بێوەژنە گەنجە مێرد مردووە (خازیێ) کە مێردەکەی دوو ڕۆژە مردووە و لەسەرگۆڕەکەی پرسەی داناوە چوومە لای، ئەو ژنە پاش مردنی مێردەکەی پەیمانی بەخواکان دابوو، هەتا ئاو بەناو ئەو جۆگەدا کە نزیکی گۆڕی مێردەکەی بوو بڕوات ئەو ئەوەندە لەسەری بگری تاسووی دەبێتەوە و دەمرێ)·

زەدیج وتی: کەواتە ئەو ژنە بەڕاستی مێردەکەی خۆی خۆشویستووە! ئەزۆرا وتی: داخ ئەوەیە، ئەگەر دەتزانی لەوکاتەدا کەمن پرسەم لێ کرد خەریکی چی بوو.

زەدیج: (خەریکی چی بوو، ئەی ئەزۆرا ! گلێنەی چاوم).

ئەزۆرا: (خەریکی گۆڕینی جۆگەی ئاوەکە بوو).

ئەزۆرا ئەوەی وت و تادڵی کەفی کرد و ناو و ناتۆر و ریسوا بوونی بۆئەو ئافرەتە مێرد مردووە هەڵڕشت، ئەوەندە ناپاکی و بەدرەفتاری دایە پاڵ تا زەدیج بەو خۆپێشاندان و خۆ بە پاك زانینەی ئەزۆرا پەست و بێزاربوو.

(ئەزۆرا) دیسانەوە بۆ سەردان و چاوپێکەوتنی دەسەخوشکەکانی چوو بوو لەڕۆژی سێیەمدا بەرەو ماڵ گەڕایەوە، کە نزیکی ماڵ بووەوە دی دەوری مالیان جەنجاڵە، هەرا و هۆریایە، بینی هەندێ لە کارەکەرەکانیان کۆتەڵی زەدیجیان لەسەردەست ڕاگرتووە و بەگریان بەرەو ئەوهاتن، بە (ئەزۆرا)یان وت: هەر لە شەوی یەکەمدا کە

ئەو لەویٚ نەبوو لەپڕ زەدیجی مێردی مرد و لــە گۆرســتانەکەی خۆیــان ئەســپەردەیان کرد، پێشیان وت: بۆیە ئەو هەواڵەمان نەدایتیٚ بۆئەوەی سەردانەکەی لیٚ تێك نەچیٚ، نەبا تووشی ڕووداوی ناکاو ببیٚ.

(ئەزۆرا) کەئەوەی پێووترا توند قیژاندی و یەخەی خۆی دڕی قژی خۆی رووتاندەوە و سوێنی خەستی دەخوارد کە خۆی دەکوژیٚ و ئیدی دوای زەدیج ژیانی ناویٚ، بەهاوار و زاری ئەو ڕۆژەی تائێوارە بەریٚ کــرد، کــە شــەو داهــات (کــادۆر) خــۆی لیٚ نزیــك کردەوە، هەردووکیان بەیەکەوە تێرگریان، ڕۆژی دوایی لە ڕۆژی یەکەم کەمترگریان، لە کاتی پراڤین خواردندا کادۆر بە ئاستەم بە ئەزۆرای ڕاگەیاند: زەدیج ڕاسپاردەی کردووە کە زۆربەی سامانەکەی بۆئەو بیٚ، ئــەزۆرا بــەو قــسەیە هەنــدیٚ مــات بــوو، کــادۆر پاشکۆیەکی بۆ هەواڵدانەوەی هێنایەوە و وتی: جا چۆن ویژدانم ڕیٚ دەدا ئــەو هــەموو سامانە بۆخۆم بەرم، وا ڕەوایە بیکــەم بــە دوو بەشــەوە، دەشــیٚ نیــوەی تــەواوی بــۆ (ئەزۆرا) بیٚ.

ئەزۆرا کە ئەوەی لە کادۆرەوە بیست، کەمیٚ وشــکە گریــانی کــرد و، لــە پــەنای وتەکانیدا دەستی کرد بە وردە تانە و تەشەردانی خۆشەویستەکەی زەدیــج: دەیــووت: خۆشەویستەکەم تابڵێی پیاوێکی چاك بوو، بەلام مرۆڤ چەند چاك بیٚ لە عەیب بە دەر نابیٚ، هەندیٚ عەیبی تیا هەبوون بڕواناکەم لە کادۆرا هەبن.

لەسەر خوانی شێوان کادۆر دەستی کرد بە ناڵە نــاڵ و خــۆپێچ دان و هــاوارکردن، دەستی خستە سەریان سپڵی و وای پیشاندا کە سپڵی هاتووەتە ژان، (ئەزۆرا) پەرۆشی دایگرت، دەستی کرد بە دەرمان نوانــدن بۆســرەوتی نازارەکــەی، دەیــووت مــەخابن (هەرمیس) ئەوەندە لەبابل نەمایەوە، هەنــدیٚ جــار دەســتی دەخــستە ســەر شــوێنی نازارەکەی و پێی دەووت: (ئەمەیە شوێن ئێشەکەت ئەریٚ ئەم ئێشەت لەپڕ بۆ هــات یان نا)؟! کادۆر وتی: ئەم ئێشە گەلیٚ جار لە مــەرگ نــزیکم دەکاتــەوە، ئەگــەر زوو (لووتی) پیاوێکی تازە مردوو نەخرێتە سەری ژیان دەرنابەم).

ئەزۆرا لەسەرخۆ وتی: (دەرمانی ئەم ئازارە چەند سەیرە! لووتی پیاوی تازە مردوو؟)

کادۆریش دەیووت: (خۆ لە نویشتەکانی نارنۆ[1] کە کۆلنجیان پێ چاك دەکاتەوە سەیرتر نییە). ئەو وتەیەی کادۆرە بیرێکی خستە ناو مێشکی (ئەزورا)وە. هەندێ مات بوو، ئەوجا وتی:

(تۆ بڵێی مێردە خۆشەویستەکەم کە دوێنێ مردووە، لە ژیانی ئەم دونیاوە بۆ ژیانی نەمری کە بە سەر پردەکەی (چینارڤار[2] ) دەپەڕێتەوە کە دەبینن کەمێ لووتی کورترە لە لووتەکەی دونیای، تۆ بڵێی ئیزرائیل بەرەو دوا بیگێڕێتەوە؟).

ئەزۆرا ئەمەی وت و لە پاشدا مووسێکی تیژی بەدەستەوە گرت و بەرەو ئەو گۆڕستانە کە زەدیچی تیادا ئەسپەردە کرابوو رۆیشت، سەری گۆڕەکەی هەڵدایەوە و لە تەنیشتیەوە دانیشت و هەندێ لاواندییەوە، ئەوجا بە ئەسپایی مووسەکەی دەرهێنا و دەستی بەرەو لووتی زەدیچ درێژکرد لەوکاتەدا زەدیچ راست بووەوە و بە دەستێکی کەپووی خۆی گرت بەویتری مووچی ئەزۆرای گرت و وتی: (خانم خازێ ریسوا مەکە، بیرکردنەوە لە لووت بڕین وەك بیرکردنەوە لە گۆڕینی ناوی جۆگەیە).

* * *

---

١- (نارنۆ) ناوی کەسێکە کە لە سەردەمی بابلییەکاندا بە نویشتە نەخۆشی کۆلنج و برکی چارەسەر کردووە، نویشتەکە بە شەمع چەور دەکرا و لە بەرگ دەگیرا و لە ملی نەخۆشەکەیان دەکرد یان لە شان وملیان دەدوری.. تا ئێستاش ئەم نویشتە نووسینە لە رۆژهەڵاتدا باوە.

٢- (چیناڤار) لە باوەڕی بابلییەکاندا ئەو پردە (السراط)یە کە لەلای ئایینە سامییەکان هەیە و بەسەر ئەودا مردوو لەم دونیاوە بۆ ئەو دونیای دیکە دەپەڕێتەوە.

## سەگ و ماین

دوای ئەو وردە ڕووداوانە کە بەسەر زەدیج دا هاتن ڕاستگۆیی پەنـدە پیرۆزەکـەی کتێبی (زەند ئاوێستا)ی بۆ دەرکەوت کە دەڵێ:

((مانگی یەکەمی هاوسەرگیری مانگی هەنگوینە، مانگی دووەمی مـانگی بـێ فەرییە)) دوای ماوەیەك زەدیج (ئـەزۆرا)ی تـەلاق دا و بـە پاکتـاوی بـەرەڵڵای کـرد چونکە لەبەر چاوی کـەوتبوو، دوای بـەرێکردنی (ئـەزۆرا) ڕووی لـەو بـوارەکرد کـە بەختیاری لێ دێتە دی کە ورد بوونەوە و ڕامانە لە سروشت، لەبەر خۆیـەوە دەیـووت کێ لەو فەیلەسووفە بەختەوەرترە کە بەو کتێبە کراوە پان و بەرینە کە سروشتە خۆی فێردەکات، سروشت کتێبێکە خوا بۆمانی والآ کردووە، ئەو ڕاستییانە کە گیانی مرۆڤ بەرز دەکەنەوە، دەروونی لـە هـەموو گـەردێك پـاك دەکەنـەوە، ئـارامی و دڵنیـایی دەبەخشن، ئەو ڕاستییانە کە بەخوێندنەوەی سروشـت دێنـە دی، بـە هاتنـەدی ئـەو ڕاستییانە مرۆڤ ترسی ئەوەی لا نامێنێ کە ژنی خراپ لێیان نزیك ببێتەوە و لووتیان ببڕێ.

زەدیج کەوتە خولیای ئەوە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە نـاو دەروونـی ئـاوەدان بکاتـەوە، گۆشەگیری و خۆ کەناردانی بۆخـۆی هەڵبـژارد، لـە خـانوویێکی لادێیانـەی دوور لـە جەنجاڵ، لە نزیك ڕۆخی فورات نیشتەجێ بوو، نیشتەنی لەو خانووەدا بۆ ئـەوە نـەبوو خۆی بە ئەژمارکردنی وردە شـەپۆلی نـاوی ژێرپردەکـان یـان بـە ئـەژمارکردنی زۆر بارینی مانگی مشك و پەزەوە خۆی خەریك بکـات، یـان خـەیاڵی بداتـە ئـەوە کـە جاڵجاڵۆکە تەنی بۆخۆی لە داوی هەورشمین چۆن دروست دەکات، یاخود بۆئەوە نـەبوو خەیاڵ لەوە بکاتەوە کە لە دێزە و دەرخۆنە شکاو چۆن سوراحی مـل باریـك دروسـت دەکرێ، بەڵکو بۆ ئەوە بوو بە وردی تایبەتمەندییەکانی زینـدەوەران و ڕووەك تێبینـی بکات، لەو کاتەوە ئەوەندە ئەزموون و زانیاری لە سروشتەوە وەرگـرت، هەسـتی بـە

بوونی هەزاران جیاوازی لە نێوان شتەکاندا بۆ دەرکەوت کە کەسانی دیکە ئەو هەستەیان نەبوو تەنیا بەرەوالەتی شتەکانیان دەدی.

رۆژێك لە نزیك دارستانێکی بچووکی ئەو ناوەدا پیاسەی دەکرد، دی وا لەدوورەوە هەندێ لە پیاوە خەساوەکانی شاژن بەهەڵەداوان بەرەو ئەو دێن، لەدوای ئەوانیشەوە کۆمەڵە ئەفسەرێکی کۆشکی شا بەپەرۆشەوە روویان لەوێ ناوە و بەملا و بەولادا دەڕوانن سەرگەردانن، وەك شتێکی گرنگیان بزرکردبێ و سۆراخی دەکەن.

خەساوی یەکەم کە گەیشتە لای زەدیج بە هەناسە بڕکێ رووی تێکرد و وتی: (ئەی گەنج لەم ناوەدا سەگەکەی شاژنت بەرچاو نەکەوتووە) زەدیج لەسەرخۆ وتی: (ئەو سەگە تۆلێی دەپرسی گەماڵ نییە دێڵە).

خەساوەکە دەست بەجێ وتی: (راست دەکەی) زەدیج دیسانەوە وتی: (دێڵێکی زۆر بچووکە، تازە ترەکیوە، لە دەستی چەپی پێشەوەی بۆی دەلەنگێ! گوێی زۆر شۆڕە) کابرای خەساو هەناسەیەکی بە خۆیدا هێنایەوە و وتی: (کەواتە دیووتە).

زەدیج وەرامی دایەوە (نەخێرنەمدیوە، هەرنەشم زانیوە شاژن سەگی وەهای هەیە).

هەرلەو کاتەدا بەرێکەوت کە سەگی شاژن هەرەتە ببوو جوانترین و خۆشرەوترین ماینی کۆشکی شایش بزر ببوو، مەیتەرەکان لە هەمو شوێنێ بۆی گەرابوون و نەیان دۆزیبووەوە، ئەوانیش وەکو پیاوە خەساوەکان بۆ ماینەکە پەرۆش بوون، بە شوێنیدا دەگەڕان، هەر لەو کاتەدا رێیان کەوتبووە لای زەدیج.

گەورەی مەیتەرەکانیش هاتە لای زەدیج و پرسیاری لێ کرد و وتی: (ئەرێ ماینەکەی پاشات نەدیووە).

زەدیج وتی: (ماینێکی خۆش رەوتە، لە رەوەتدا پێنج پێ بەرز دەبێتەوە؟ سم بچووکێکە؟ کلکی سێ پێ و نیو درێژە؟ جەلەوەکەی زێری بیست وسێ قیرانە؟ نالەکانی لە زیوی عەیار دوانزە دانیسقە؟)

سەرۆکی مەیتەرەکان وتی: (وایە، کوا لە کوێیە و بە کوێدا چوو؟)

زەدیج وتی: (نەدیومە، نە گوێم لێ بووە پاشا ماینی وەهای هەبێ).

گەورەی مەیتەرەکان و خەساوی یەکەمی خەساوەکان گومانیان لەوەدا نەبوو کە ماینەکەی شا و دێڵەکەی شاژن جگە لە زەدیج کەسی تر نەیدزیون، هەربۆیە دەمە پێش خۆیان دا و بەو تۆمەتە رەوانەی دادگایان کرد.

دادوەرەکان حوکمی شەلاق لێدان و دەربەدەرکردنی بەرەو سارای سیبریا بۆ دەرکرد بۆئەوەی تا ماوە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی ولاتی بابلدا بەسەربەرێ بەرلەوە حوکمەکە دەربچوێنن، ماین و دێلە سەگەکە دۆزرانەوە، دادوەرەکان ناچاربوون حومەکەیان بگۆڕن، بەڵام فەرمانیان بەوەدا کە زەدیج دەبێ چوارسەد میسقاڵ زێڕ بدا، چونکە نوکلی لە بینینی سەگ و ماینەکە کردبوو.

دەبوو زەدیج لە پێشەوە ئەو باجە بدا ئەوجا بۆی هەبوو بەرانبەر دادوەرەکان راوەستێ و پارێزەری لە خۆی بکات.

زەدیج بەرەنگاری لەخۆی کرد و وتی: (گەورە و بەرێزان، ئەی ئەستێرە درەوشاوەکانی داد، ئەی پاریزەرانی مافی مرۆڤ خوراوان، ئەی رۆژانی رووناکی جیهان، ئەی ئەوانەی لە قورقوشم سەنگین و قورستر لە ئەلماس شەوق دەرتر، ئەی ئەوانەی وەکو زێری پاڵفتە پاڵفتە تر، سوپاستان دەکەم چونکە لەبەر دەمتاندا راوەستاوم دەرفەتی پەیڤدانتان پێ بەخشیوم، سوێند بە گەورەیی (ئەهرۆمەزدا) سەگی شاژن و ماینە پیرۆزەکەی شای شایانم بەم چاوانەی خۆم نەدیووە، ئەوەی من دەربارەی ئەو سەگ و ماینە زانیبێتم بەم جۆرەیە کە بۆتانی دەگێڕمەوە:

ئەو رۆژە بەرێکەوت بە نیازی پیاسەکردن لە ماڵ هاتمە دەرەوە لە نزیک ئەو بێشەدا کە پیاسەم دەکرد، دیم رێزدار خەساوی یەکەم و، سەرۆك مەیتەرانی ناودار بەشوێن سەگ و ماینداا دەگەڕێن، بەرلەوان بێنە لام لەسەر خۆڵی ئەو ناوە ئاسەواری سەگێکی بچووکم دی، لە نێوان شوێنەواری قاچەکانیدا، چەند ئاسەوارێکی ئاستەم لە چەند شوێنێکی بەرزدا دی بەوا زانیم ئەو سەگە دێڵە و تازە ترەکیوە. لە شوێنێکی تردا لە ئاسەواری رۆیشتنەکەی ورد بوومەوە دیم لە میانەی شوێنی قاچەکانیدا

جاروبار شتێك لە كۆسپی ڕێگەكە خشاوە، بەوە زانیم ئەو دیڵە گـوانی شـۆرەو تـازە زاوە. لە كەنار شوێنی قاچەكانیەوە سۆراخی شتێكی ترم كرد، هێڵێكی نەسـپایی لـە نێوان قاچەكانیدا لەسەر خۆڵەكە چاپكرابوو، بەوەیشدا بۆم دەركەوت كە ئـەو سـەگە گۆی شۆرە، لە شوێنێكی تری ئاسەواری ڕۆیشتنەكەیدا دیم خۆڵەكـەی لای قاچـێكی كەمتر روو چووە تا شوێنی سێ قاچەكەی دیكەی بەوا زانیم دێلكەی شـاژنی هێـژا و پایەدار تۆزێ دەشەلێ.

لەبارەی ماینەكەی شای شایانەوە: بەناو تولـە ڕێـی دارسـتانەكەدا دەڕۆیـشتم ئاسەواری سمی چوارپەلی ماینێكم بەرچاو كەوت، سەرنجم دا ماوەی نێوان هەرچـوار پەلەكە بێ زیاد و كەم یەكسان بوون، لەدڵ خۆمدا وتم ئەم ماینە كە بێرەدا گـوزەری كردووە ماینێكی خۆش ڕەوتە، هەروەها دیم تـۆزی سـەرپەلكی ئـەو درختانـە كـە لەمبەر و لەوبەری ڕێگەی ڕۆیشتنەكەیدا هەبوون، بەپانی حەوت پێ بوو، لە ڕاست و چەپەوە تۆزەكە سڕابووەوە بەوەشدا زانیم كلكی ئەو ماینە حەوت پێ درێژە.

ئەو درەختانە كە ماینەكە لە بنیاندا حـەوا بـووەوە، چـەند گەڵایـەكی سـەوزی تازەكەوتوو هەبوون، زانیم ئەو گەلایانە بە پشتی ئەو ماینە كەوتوون و بەرزایی لقی گەڵاكان پێنج پێ بەرزبوو، بەوەشدا بۆم دەركەوت بەرزی ئەو ماینە پێنج پێیـە، بـە چیا زانیم جەڵەوەكەی زێری عـەیار بیـست و سـێیە، چـونكە قەپۆسـی بـە بـەردێك خوراندبوو، زێرەكەی جەڵەوێ بەرئەو بەردە كەوتبوو، بەو بەردەدا زانـیم كـە زێرەكـە ئەوەندە عەیارە، ئەوە بـە تاقیكردنـەوە زانـراوە، لـە شـوێنێكی تریـشدا ئاسـەواری سمەكانیم لەسەر بەردێكی دیكەم دین، بۆم دەركەوت ناڵی سمەكانی لـە زیـوی عـەیار بیست و یەك دانگن.

دادوەرەكان لە بلیمەتی و ژیـری زەدیـج سـەریان سـوڕما، چیرۆكی ئـەو ڕووداوە گەیشتە لای پاشا و شاژن، لە هەموو شوێنێك دەنگی دایەوە و ناوی زەدیـج كەوتـە سەر هەموو زارێك و ناودار بوو، كەچـی كاهینـەكان داوای سـوتاندییان دەكـرد بـەو

تۆمەتەی کە گوایا جادوگەرە، پاشا کە ڕووداوەکەی زەدیجی بەو جۆرە بیست فەرمانی دا ئەو چوارسەد میسقاڵە زێڕەی کەلێ سەنرابوو بیدرێتەوە.

پیاوەکانی کۆشکی پاشا بەکەش و فشێکەوە هەر چوارسەد میسقاڵە زێڕەکەیان بۆ زەدیج بردەوە جگە لە سێسەدو نەوەد و هەشت میسقاڵی نەبێ کە بۆ خەرجی دادگا و دادوەرەکان دانرابوو ئەویتریان بێ زیاد و کەم بۆ بردەوە، پیاوەکانی کۆشکیش بە تەمای بەخشیشی خۆیان بوون.

زەدیج بۆی دەرکەوت مرۆڤ چەند پلەی زانیاری بەرزبێ بەرەو ئاستەنگی خەتەرناك نزیك دەبێتەوە، پەیمانی بەخۆی دا چەند پێی بکرێ خۆی لە ئاست ڕاستی گێل بکات.

ڕۆژێك ڕێکەوت وابوو بەندەییەك لە بەندیخانەی دەوڵەت ڕادەکات و بەژێر پەنجەرەی ماڵەکەیدا تێدەپەڕێ، کە پرسیار لە زەدیج کرا وتی کەسم نەدیووە لێرەوە تێپەڕێ، کەچی بەڵگە سەلماندی کەئەو لەوکاتەدا لە پەنجەرەکەیەوە دەیروانییە دەرەوە، لەبەر ئەوە بری پێنج سەد میسقاڵ زێر تاوانەی لێ سەنرا، لە وڵاتی بابل وەها باوبوو! دەبوو کەسی حوکمدراو سوپاسی دادوەرەکان بکات.

زەدیج بەپێی ئەو یاسایە سوپاسی دادوەرەکانی کرد چونکە بەزەییان پێ کردبوو!

زەدیج لەبەرخۆیەوە دیووت (ئەی خوایا بەزەیت بەکاربێنە بۆئەو کەسەی کەلە دارستاندا پیاسە دەکات و سەگی شاژن و ماینی شای پیادا تێدەپەڕن، بەزەیت بخەکار بۆئەو کەسەی لە پەنجەرەی ماڵی خۆیدا سەردێنێتە دەر.. زۆر ئەستەمە مرۆڤ لە ژیانیدا بەختەوەر ببێ)..

* * *

# پیاوە ڕژدەکە

زەدیج ویستی لە بواری ئەو جۆرە ژیانە کە تەگـەرەی بـۆ دەنایـەوە دوور بکەوێتـەوە، ڕووی کردە لایەنێکی ترکە لایەنی فەلسەفەزانی و گرتنـی برادەرایـەتی بـوو، لـەدەرەوەی شاری بابلدا خانووێکی خنجیلانەی هەبوو، بەجۆرەها شتی هونەری ڕازرابوونـەوە، ئـەوەی دۆست و برادەران چـێژیان لێ وەردەگـرت تیایـدا هـەبوو، لـە بەیانیانـەوە کتێبخانەکـەی بۆگشت زانایان دەکرایەوە، لە ئێوارانیشدا خوانی ڕازاوەی بەرین بـۆ بـرادەران ئامـادەکرا، ماوەیەکی نەخایاند بۆی دەرکەوت: زانیاری دە هەندە لە هەموو شـتێ مەترسـی دارتـرە، لەوکاتەدا مشتومڕێکی خوێناوی لە نـاو موغانەکانـدا لەسـەر یـەکێك لـە قانوونـەکانی زەردەشت ڕووی دا، بەپێی ئەو قانوونە خواردنی گۆشتی عەنقا حەرام کرابوو.

مشتومڕ لەسەر ئەو قانوونە ببوو بە ئاگرێك هەموو سەردەمی ولاتـی بـابلی تووشـی بگرە و بەردە کردبوو، مۆغانەکان ببوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان دەیـانووت: (بۆعـەنقا — سیمرخ — خۆی هەیە تا گۆشتی بخوری).

هەندێکی تر دەیانووت: (ئەگەر عەنقا نەبوایـە هەڵبەتـە زەردەشـت خـواردنی حـەرام نەدەکرد).

ئەو پرسە خەلکەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە، هەریەك تێغی بۆ ئەویدیکـە دەسـووی، زەدیج ویستی ئاوێ بەسەر ئەو ئاگرەدا بکات و هەردوو لا لەیەك نزیك بکاتەوە، بۆیە وتی ((ئەی خەلکینە ئەگەر عەنقامان دەستکەوت ئەو کات خواردنی حـەرام دەکـەین، ئەگـەر دەستیش نەکەوت با خـواردنی حـەرام بـێ)) بـەم جـۆرە هـەموو ملکەچـی قانوونەکـەی زەردەشت دەبین و هیچ لادانێکیش لە فەرموودەکەی دەرناچێ.

زانایەك هەبوو کتێبێکی لەسیزدە بەرگدا لەسەرخەسـڵەت و تایبەتییـەکانی باڵنـدەی عەنقا دانابوو، جگە لەوەش ئەو زانایـە بـە خـاوەن کـەرامات ناسـرابوو، خـۆی گەیانـدە مۆغەکان کە ناوی (بەیبوور) بوو، چەند بلێی کەر و وشك و تیژڕەو بوو، داخی زەدیجی لـە

دلّدا بوو، له وانەبوو سـەختترین سـزای بەسـەردا بـسەپێنێ، لێـی دەوەشـایەوە بـە ئـاگر بیسوتێنێ و بیکات بە قوربانی بۆ شـکۆمەندی خـۆر، لـەکاتی سوتانەکەشـیدا لەسـەری راوەستێ و یەسناکانی بخوێنێ و ویژدانی ئاسوودە بکـات. کـادۆر بـرادەری راسـتەقینەی زەدیج بوو، دیارە برادەری راست لەسـەد قەشـە چـاکترە، کـادۆر کـە زانـی لای گـەورەی مۆغانەکان زمانی پیس لە زەدیج دراوە، بەپەلە خۆی گەیاندە پیری پیران (بـەیبور) لەبـەر دەمیدا راوەستا و هاواری کرد، با بژی خۆر، با بژی عەنقا، هەندێکی تر لێی نزیك بـووە و وتی:

(ئەی پیری پیران، شالیاری هـەموو موغـەکان نەکـەی زەدیـج ئـازار بـدەی، زەدیـج موغێکی دلّسۆز و بەندەی ئەهرۆمەزدایە، مالّەکەی پڕ لە جۆری بالّندەی عەنقایە لەگـەلّ ئەوەشدا گۆشتیان نـاخوات، بـەلام ئـەوەی لای بـەرێزتان زەدیجـی گوناهبـار کـرد خـۆی تاوانبارە، باوەری چەوتی دەربارەی کەروێشك هەیە ـ دەلّێ: کەروێشك سموچکە قلّیـشاوە و ئاژەلّێکی گلاّو نییە.

(بەیبور) دەستێکی بە سەرە سافەکەیدا هێنا و وتی: (باشـە ئـازاری زەدیـج دەدەیـن چونکە ناوی عەنقای بە خراپ بردووە، ئازاری ناحەزەکەشـی دەدەیـن چـونکە رای لەسـەر کەروێشك خراپە!).

کادۆر کە زانی کارەکە بەو جـۆرە چارەسـەرنەکرا هۆیـەکی تـری خـستەکار، ئـەویش بەکارهێنانی ئەو ژنە گۆرانی بێژە پایەداربووە کـە لـە بـەیبور منـدالّێکی ببـوو، بـەهۆی ئەوەوە کەس سزا نەدرا، ئەو ژنە سۆزانییە لای گشت کاهینەکان هێژابوو، ئەو سزا نەدانـە لەلای زاناکان بە نیشانەی رمانی شاری بابل درایە قەلّەم.

زدەدیج دەیووت: (بەختەوەری لە چیدایە؟ هەموو شتێ کەلەم گێتییەدا هەیە سەخلەتم دەکات تەنانەت ئەو شتانەش کە نین ئازارم دەدەن). لەوسـاوە رکـی لـە زانایـان بـووەوە، بریاریدا تەنیا ژیان لە تەك برادەرانی راستگۆدا بباتە سەر.

ئیدی دەسی دایە جوامێری، مالّەکەی خۆی کرد بە شـوێنی کۆبوونـەوەی شەونـشینی گەورە پیاوان و شۆخەژنانی شاری بابل، خوانی پڕ لە خواردنی بـۆ دەرازاندنـەوە، مۆسـیقا

دەژەنـرا و، قـسەی خـۆش و پەنـد و سەرگوزشـتەی دوورلـە ریـا و درۆ دەگێردرانـەوە، دەمەتەقێ ی ناو جڤارتەکەی لەگاڵتە و گەپی داتاشـراو رووپامـا لادەدا چـونکە دەیزانـی ئەوەی هەست و چێژ دەرووشێنێ و پەیوەندییەکان تێك دەدات وتە و گەپی داتاشراونە.

ماڵی پیاوێکی ناشرین و کەللەرەق و رژد لە خانووەکـەی زەدیجـەوە نزیـك بـوو نـاوی (ئەریماز) بوو، بێ پێووتن دەچووە ماڵی زەدیـج، رژدییەکـەی نـاو هـەناوی خـۆی بۆگـەن کردبوو، لەوچەیەکی ترن و زۆر بلی و بێ چاو و روو بوو، لە ژیانیدا سەرکەوتنی لـە هـیچ کارێکدا بەدەست نەهێنابوو، بۆیە خووی دابووە قسەی پاشملە و غەیبەتی خـەڵکی کـردن، ئەوانەی کە دۆستایەتییان دەکـرد ئەوانـە بـوون وەکـو خـۆی نـانی خـەڵکیان دەخـوارد و خوانەکـەیان دەدڕانـد، ئـەوەی ئـەریمازیان پەسـت و نارەحـەت کردبـوو ئـەو سـوپاس و شایستانەبوون کە بۆ زەدیج دەکران، گەلێ جار دەچووە سەرخوانی خواردنەکان بـێ ئـەوەی پێی وترابێ: فەرموو، نامادەبوونەکانی دەبوونە هۆی تێکدان، وەکـو باڵنـدەی لـەڕ وابـوو دەستی لە هەر خواردنی بدایە لەبەر چاوی دەخست، رۆژێك ویستبووی رێز لە خانمێك بنـێ و میوانداری بکات، پێی نەکرابوو هەرئەوکات خۆیشی چوو بوو. لـە مـاڵی زەدیـج نـانی خواردبوو. جارێکیان لەناو کۆشکەکەی زەدیجدا بەدەم قسەکردنەوە پیاسە دەکەن یەکێك لە وەزیرەکان بە لایاندا تێدەپەرێ و بۆ خواردنی شـێوان زەدیـج داوەت دەکـات و ئـاوڕ لـەو ناداتەوە.

دیارە هۆکانی دوژمندارییە فرە سامانەکان لە هۆیە قیزەونەکان قێزەون ترسناکتر بن.

رکی زەدیج لە ناخی (ئەریماز)دا ماوەیەك بوو چەکەرەی کێشابوو، ئـەو کابرایـە لـە هەموو بابلدا بەرژد ناسرابوو، لە مێژ بوو دەیویست داوێك بۆ زەدیج بنێتـەوە و لـە نـاوی بەرێ.

زەردەشت وتوویەتی: (دەرفەت بۆ خراپەکردن لە رۆژێکدا سەد جار دێتە پێـشەوە وەلێ دەرفەتی چاکە لە ساڵێکدا یەکجار دێتە پێشەوە).

رۆژێ ئەریمازی رژد و چلووك وەکو خووی پێەوە گرتبوو سەردانی زەدیجـی کـرد، دی وا لەگەڵ دوو برادەری و ژنێکدا لە ناو باخچەکەیدا و قسەی خۆش دەکـەن، زەدیـج لـە نـاو

قسەی خۆش و دەمەتەقێدا جاروبار وتەی غەمزە ئامێزی بۆ ئافرەتەکە دەردەبڕیّ، مەبەستی لە وتەکانی هەر وشەی رووت بوون.

قسە و دەمە تەقیّ گەیشتنە سەر ئەو جەنگەی کە پاشا تیایدا بەسەر یەکی لە ئەمیرە یاغیبووەکاندا لە (ئۆرکانیا) سەرکەوتبوو، زەدیج باسی ئازایەتی پاشای لەو شەڕەدا کرد، بەو بۆنەوە لەو کاتەدا دەستی دایە پارچە تەختەیەك و دوو بەیتە هۆنراوەی لە سەر نووسی و دایە دەست ژنەکە، دوو پیاوەکە داوایان لە زەدیج کرد ئەو دوو بەیتەیان بەئاواز بۆ بخوێنێتەوە، بەڵام زەدیج لەبەر رەندی و خانەدانی خۆی هەڵنەکێشا بۆی نەخوێنندنەوە و دەستی دایە تەختەکە و کردی بە دوو کەرتەوە و توورِیدانە ناو چەنگەڵی گوڵەکانەوە، لەپاشدا بەشوێنیاندا گەران نەیاندۆزینەوە، کە ئەوان رۆیشتن کابرای رژدە بەشوێنیاندا گەرا، دوای ماندووبوونێکی زۆر یەکێك لەپارچەکانی دۆزییەوە، کە پارچە هۆنراوەکانی لەسەربوو، رێکەوت وای هێنابوو ئەو پارچەیە ببوو بە چەند پارچەوە، هەرپارچەیەك وشەیەکی لەسەربوو هەریەك دەلالەتی لەسەر مانایەکی جیا دەکرد، هەرمانایەکیش جۆرە دژوێنێکی ناشرینی دژ بەپاشا دەگەیاند، بەم جۆرە دەخوێنرانەوە:

شا، ئاژاوە و، تاوان

لە دوور و نزیك دژهەموان

پیاوە رژدەکە، کە ئەو وشانەی لەسەر پارچە تەختەکان خوێندەوە وای زانی ئەستێرەی نگین و بەختیاری هەڵهاتووە، زانی ئەگەر ئەو وشانە لەسەر ئەو پارچە تەختانە بەدەست پاشا بگەن، دەتوانن زەدیج لەکۆڵ بکەنەوە، گەلیّ دڵی بەو بەختەوەرییە نالەبارە خۆش بوو، زوو ئەو وشانە کە بە دەستی زەدیج نووسرابوون گەیاندنی دەستی پاشا، دەستبەجیّ زەدیج و دوو برادەرەکەی و ژنەکە توندی بەندیخانەکران، بیّ ئەوەی پرس و خواستێکیان پیّ بکریّ یان بزانن گوناحیان چییە، کابرای رژدە لەسەر رێگای بردنە بەندیخانەیاندا راوەستابوو، کە چاوی بە زەدیج و برادەراکانی کەوت باڵبەست کراوان و بەرەو بەندیخانە دەربرێن، دەسێکی بەسمێڵیدا هێنا و بەزەردەخەنەیەکی تەڵخەوە وتی:

بەخوا هەڵبەستەکانت بێ تام و بێ مانا بوون.

زەدیج نە ئاگای لەهەڵبەست بوو، نە خۆیشی بە شاعیر دەزانی، لەوکاتەوە زۆر سەرسام مابوو نەیدەزانی بۆ زیندانیی دەکەن، داخۆ چ گوناهێکی هەیە، کەی بە شیعر زەمی پاشای کردووە، دەیووت: (گریمان من گوناهێکم کردووە و نایزانم ئەی ئەو دوو برادەرە و ئەو ژنە بۆ بە گوناحی من بسووتێن).

یاساکانی بابل وەهابوون، زەدیج بە بەرچاو کەسوکار و ناسیاو و دۆست و برادەرانەوە بەرەو بەندیخانە و سزادان رادەکێشرا، لەیارای کەسدا نەبوو دەنگ بکات یان لەقەراغ چاویدا فرمێسکێکی بۆ دەربدات، تەنیا چوونەکەیان بۆ ئەوە بوو بەزەیی خۆیان یان جۆرە سۆزێکی خۆیان بۆ دەربڕن و سەیری نێوچاوانی بکەن کە بەرەو مردن دەیبەن چی لەنێو چاوانیدا دەخوێنرێتەوە، زەردەخەنەیە یان پڕ لە پەشیمانی و خەجاڵەتە، تەنیا خانەوادەکەی بۆی بە غەم بوون ئەویش لەبەر ئەوە بوو، میراتی بۆ بەجێ نەهێشتبوون، چونکە سێ چواریەکەی بۆ دەوڵەت دانرابوو، چواریەکەکەی تری کرابوو بە پاداش بۆ پیاوە رژدەکە.

زەدیج لە بەندیخانەدا چاوەڕوانی کات و ساتی مردنی خۆی دەکرد، لەو لاشەوە چەرخ پیلێکی تری تەقان، توتییەکەی پاشا، لە کۆشکی شاوە بەرەو باخچەی خانووەکەی زەدیج فڕاند، لەسەر لقێ لە بنە گوڵەکان دەنیشێتەوە، لەوکاتەدا دەنکە قۆخێک لەدار بەردەبێتەوە و دەکەوێتە سەر ئەو پارچە تەختە بزربووە کە زەدیج هەڵبەستەکانی لەسەر نووسی، تووتییەکە، قۆخەکەی بەپارچە تەختەکەوە هەڵدەگرێ و بەرەو کۆشک گەڕایەوە، قۆخە و پارچە تەختەکە لەبەردەم پاشادا دادەنێ، پاشا لە پارچە تەختەکە ورد دەبێتەوە، نووسراوە بەڵام وشەکانی سەری مانا نادەن، لە وشەی هۆنراوەیەکی سەروادار دەچن، پاشا چێژی لەشیعر وەردەگرت، بۆیە ئەو وشانەی سەرئەو تەختە و کاری تووتییەکەی دەرگای خەیاڵیان بۆ کردەوە، پاشاکان سەین و سەودایان لەگەڵ شیعردا هەیە، ئەو پارچە تەختە نووسراوە کە رژدەی زەدیج هێنابوونی لەبیری شاژندا مابووەوە، بۆیە داوای هێنانی ئەو تەختەی کرد، کە پارچە تەختەکان بەیەکەوە نووسانەوە دەرکەوت هەموو پارچەی یەك

تەختەن، کە بەیتەکانی سەری خوێنرانەوە، زەدیج بەم جۆرە ئەو دوو بەیتەی لەسەر نووسیبوون:

کە شەپۆلی دا ئاژاوە و تاوان
شا سەرکەوتە سەرقەڵای دوژمنان
ئاشتی دامەزرا لە نزیك و دوور
جەنگ بەلایەکە دوژمنی هەموان

کە ئەو دوو بەیتە خوێنرانەوە دەستبەجێ پاشا فرمانی دا زەدیجی بۆ ئامادەکەن و دوو هاوەڵەکەی و ژنەکەش لە بەندیخانە بەربدرێن.

کە زەدیج هێنرا بەردەم پاشا و شاژن، سەری بۆ شکۆمەندییان دانەواند و تکای لێ کردن کە سەبارەت بەو دوو بەیتە کرچ و کاڵ و لار و لەنگەی لێی ببورن، ئەوەندە زمان و گفتی پاراوبەتام بوو داوایان لێ کرد کە ئەو دوو بەیتەیان بۆ بخوێنێتەوە، هەردووکیان بە خوێندنەوەکەی سەرسام بوون شیعر بێ زەدیج لەبەردەم شا و شاژندا بیخوێنێتەوە.

چی سامانی رژدە هەبوو کە بەناحەق خرێ کردبووە بەخشرا بە ئەو، بەلام زەدیج هەمووی بۆ گێرایەوە، لەو کاتەوە رەزامەندی شا بۆ زەدیج لە دڵیدا جێگیربوو، هەر لەو کاتەوە وەکو راوێژکاری شای لێ هاتبوو، لە هەموو ئاهەنگەکانیدا ئامادە دەبوو، پرس و رای لە کاروباردا وەردەگرت، شاژنیش بەسۆزەوە سەیری دەکرد، سەیرکردنەکەی گڕێك بوو لەوانەبوو کلپە بدات و ژیانی خۆی و شا و زەدیج وکۆشك و دەوڵەتی پێ بسووتێ.

زەدیج مەزندەی وابوو: ئەستەم نییە کە مرۆڤ بەختەوەر ببێ.

* * *

# جوامێری

لە بابلدا نەریت وابوو هەرپێنج ساڵ جارێك جەژنێ ساز دەکرا بۆئەو کەسەی کە لەماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کارێکی جوامێرانەی وەهای کردبێ شایستەی ئەوەبێ خەلات بکرێ و ببێ بە نموونە بۆ هاوولاتیان.

لێژنەی دیاری کردنی ئەو خەلاتە بۆئەو کەسە کە بەیەکەم دەردەچوو پیاو ماقوولاَن و مۆغانەکان بوون، پارێزگارانی شارەکانیش هەریەك هەڵبژاردەی خۆی دەهێنا و پێشکەش بە لێژنەی دەکرد، ئەندامانی لێژنە لەناو ئەوانەدا کە ناویان پێشکەش دەکرا، ئەوەیان کە شایستەی ئەو خەلاتە بوایە، دەیاندایە شا بۆئەوەی ئەویش فەرمانی لە سەر بدات، لە هەموو دەڤەرەکانی بابلەوە، خەڵك لەو رۆژەدا دەهاتن و بەشداری ئەو ئاهەنگەیان دەکرد و دەرچووی یەکەمیان دەدی.

شا بە ئامادەبوونی جەماوەر لە رۆژی جەژندا (بادە — کاس) یەکی زێرینی بە جەواهیر موتربەکراوی بە یەکەمین جوامێر دەبەخشی، لەکاتی بەخشینی ئەو بادەدا شا پێی دەووت: (ئەوە خەلاتی جوامێرییە پێت دەبەخشم، خوا نموونەی وەك تۆمان لەناو هاوولاتیاندا بۆ زۆر بکات).

لەو رۆژەدا خەڵك لە هەموو شوێنێکەوە دەهاتن و دەرژانە ناو گۆرەپانە گەورەکەی ناوشاری بابل، شا هات و بەرامبەر بە جەماوەر لەسەر تەخت دانیشت، پیاوانی دەوڵەت و کاهینەکان دەورەیان دا، پاش ئەوانیش پارێزگارانی دەڤەرەکانیش هاتن، بۆ ئەوەی هەریەك دەستە گوڵی دەڤەرەکەی خۆی بە جەماوەر پێشکەش بکات.

ئەو جەژنە بۆ ناسینی ئەوانە نەبوو کە بە زۆرانبازی و بەکارهێنانی هونەری شیر و تیرەوشاندن هەڵبژاردە دەکران، بەڵکو بۆ ئەوانە بوو کە رەوشت باش و خۆبەختکار و جوامێر بوون، یەکەم جار پارێزگاری شاری بابل هاتە پێشەوە و بە دەنگێکی بڵند کۆمەڵە کردەوەیەکی جوامێرانەی هەندێ کەسانی بە خەلکەکە راگەیاند کە شایستەی

ڕێز لێنانن و خەلاتن، کەچی باسی جوامێرییەکەی زەدیجی نەکرد، ئەوەبوو کابرای ڕژدە لە مردن نزیکی کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو سامانەکەی کەلە سزای تۆمەتەکەیدا درا بە زەدیج هەمووی بۆ گێرایەوە، دیاربوو لەڕای پارێزگاری شاری بابلدا ئەو کارەی زەدیج لەوانە نەبوو بخرێتە ناو، ناوی ئەو کەسانەوە کە بەشدارکرابوون بۆ خەلاتەکە.

لەپێش هەموویانەوە ناوی ئەو دادوەرە جاڕ درا کەلە هەندێ حوکمدا هەڵەی پێکرابوو، وازی لەهەموو سامانی خۆی هێنابوو بۆ ئەو کەسەی کەبە هەڵە حوکمی بۆ دەرچوو بوو، سامانی ئەو دادوەرە بارتەقەی ئەو زەرەرە بوو کە حوکمە هەڵەکە لە حوکمدراوی خستبوو.

پاش ناوی دادوەرەکە جوامێری گەنجێك خوێنرایەوە، کە گوایا ئەو گەنجە کچێکی زۆر خۆشویستووە و گەرەکی بووە بیکات بە هاوسەری خۆی، کەبۆی دەردەکەوێ ئەو کچە لەپێش ئەوا کوڕێك عەشقی دەبێ، بەلام لەبەر دەستکورتی نەیتوانی بوو بیگوازێتەوە، کوڕە گەنجەکە کە ئەوە دەزانێ واز لە دلدارەکەی بۆ کوڕە هەژارەکە دێنێ و چی پێویستی گواستنەوە و خەرجی مارەییشی دەبێ دەیداتێ.

سێیەم ناوی سەربازێك دەخوێندرێتەوە، ئەو سەربازە تووشی بەلایەکی وەها دەبێ، مافی ئەوەی بداتێ کە جوامێرییەکەی بەسەر جوامێری دووەکەی پێشوودا سەربکەوێ.

ئەو سەربازە لە شەڕەکەی (هیرکانیا)دا دوو سەربازی دوژمن دۆستە خۆشەویستەکەی دەفڕێنن، ئەویش لەگەڵیاندا دەکەوێتە جەنگەوە بۆ ئەوەی لە دەستیان رزگاری بکات، نزیك دەبێ بەسەریاندا زاڵ ببێ لەوکاتەدا هەواڵی دەدرێتێ کە لە لایەکی ترەوە سەربازەکانی دوژمن دەیانەوێ دایکی بڕفێنن، سەربازەکە بە قورگی گریان و حەسرەتەوە واز لە خۆشەویستەکەی دێنێ و پەلامار دەدات دایکی رزگار بکات، دوای رزگار کردنی دایکی دەگەڕێتە لای دەزگیرانەکەی، دەبینێ وا لە دوا هەناسەی ژیاندایە، دەیەوێ خۆی بکوژێ، بەلام دایکی فریای دەکەوێ و پێی

دەڵێ: (تۆ تاقە کوڕمی، بێ تۆ ژیان دەرنابەم). ئازایەتی ئـەو سـەربازە لەڕادەیەکـدا دەبێ کە بتوانێ لەڕێی دایکیدا بەرگەی ئەو هەموو کارەساتە بگری، هەموو دادوەر و مۆغانەکان مەیلیان لەسەر پەسندکردنی ئەو سەربازە بوو کـە بیکـەن بـە جـوامێری یەکەم. هەموو خەڵك چاوەڕاوان بوون شا بڕیاری خۆی بدا، کەچی ئەو وتی: ((ئـەوەی بەسەر ئەو سەربازە و ئەوانەی پێش ئەویشدا هاتووە مافی جوامێرییان هەیـە، بـەڵام ئەوەی خۆم بە چاوی خۆم لـە زەدیجـەوە دیـم لـە هـەموو ڕووداوەکـانی ئەوانـە پـتر سەرسامیان کردم، چەند ڕۆژێ لەمەوبەر لە وەزیرێکم کە ناوی (کۆریـب) بـوو تـووڕە بووم و لە وەزیریم خست، هەموو دەست و پەیوەندی کۆشك دەیـانزانی ئـەو وەزیـرەم چەند لە منەوە نزیك بوو، داوام لە هەموان کرد بە ئارەزووی خۆیان تانەوتەشـەری لێ بدەن و ڕکیان لێی ببێتەوە و لەبەرچاومی بخەن، پرسیارم لە زەدیج کرد کـەڕای خـۆی لەسـەر دەربـڕێ، کـە دەمـی کـردەوە بـێ تـرس و بـێم دەسـتی کـرد بـە مـەدح و ستایشکردنی، من چاوەڕوانی ئەوەم لێوە دەکرد ئەویش جامێ ڕك وکینـەی بەسـەردا بکات کەچی وانەبوو، ئەوەی من لە پێشینانەوە بیستبێتم و ڕووی داوە ئەوانـەی کـە هەڵەیەکیان لەدەست دەرچووبێ، بە بەخشینی سامانی خۆیان ڕاستییان کردووەتـەوە، یان گەلێ جار ڕوویداوە پیاوی عاشق لەبەر خاتری دایکی وازی لە دڵدارەکەی هێناوە، کەچی هەرگیز نەم بیستووە یەکێکی ناو کۆشك مەدح و ستایشی کەسێك بکات کـە بزانێ شا ڕکی لێ دەبێتەوە: من بڕیارم وایە بۆ هەریەك لەو پاڵەوانانە بیـست هـەزار دیناری زێر دەبەخشم، بەڵام کاسی جوامێرییەکە بە زەدیـج دەبەخـشم)) کـە زەدیـج ئەوەی لە شاوە بیست چووە بەردەمی و وتی: ئەی گەورەم، ئەی خـاوەن شـکۆ، ئـەو خەڵاتە تەنها شایستەی پایەداری خۆتانە، چونکە خاوەن شکۆتان کارێکتان کـرد لـە جوامێریدا وێنەی نەبێ.

ئەی خاوەن شکۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆ لەوپەڕی تووڕەبووندا بووی، لەوەی من وتم لە بەندەی خۆت نیگەران نەبووی، هەرگیز ڕووی نەداوە شایەك شـتێکی گـەرەك بـێ

کەچی بەندەی لە روویدا راوەستێ و بە پێچەوانەوەی خواستی ئەو رەفتار بکات و لێی تووڕە نەبێ)).

خەڵکەکە لە هەڵوێستی شا و زەدیج سەرسام بوون. ئەو دادوەرەی کەلە هەموو سامانی خۆی وازی هێنا، ئەو عاشقەی کە بۆ برادەرێکی وازی لە دڵدارەکەی هێنا، ئەو سەربازەش کە رزگاربوونی دایکی پێ گەورەتر بوو تا رزگارکردنی دۆستە خۆشەویستەکەی هەموو خەلاتی شایان وەرگرت، ناویان لە تۆماردا بە جوامێر ناوزەدکرا، (زەدیج)یش کاسە زێرینەی جوامێرایەتی وەرگرت، (شا)ش ناوبانگی دەرچوو کە شایەکی گەورە و میهرەبانە، بەلاّم ئەو ناوداریەی ئەوەندە درێژەی نەکێشا، ئەو رۆژەش تەرخان کرا بۆ ئەو جەژنە کە قانوون بەشەرمەوە بڕیاری لە سەر دابوو، ئەو جۆرە جەژنە لەو رۆژەدا تا ئێستاش لە بیرەوەری خەڵکی ئاسیادا ماوە،،، زەدیج وای دەزانی ((کە بەختەوەر بووە)) بەلاّم بە هەڵەدا چووبوو.

* * *

# وەزیر

وەزیری دەستە راستی شا ماوەیەکی زۆر نەبوو مردبوو، شا زەدیجی لە شوێن ئەو دانا و کردی بە گەورەی وەزیرەکان، بە دانانی زەدیج لەو پایەدا هەمووی گەنج و جوانانی بابلی دڵخۆش کرد، چونکە لەوەتەی ئەو دەوڵەتە دامەزرابوو تا ئەو کاتە وەزیرێکی گەنجی وەکو زەدیج گەنج و لێهاتووی بە خۆیەوە نەدیبوو، بەو دامەزراندنە پیاوەکانی سەر بەکۆشك کەوتنە ناوگۆمی غەمەوە، بە تایبەت کابرای رژدە، غەم تووشی دیقی کرد و سنگی کەوتە لرخە لرخ، هەناسەی سواربوو لەباتی تف گۆڵمە خوێنی دەهێنایەوە، کەپووشی تووشی ئاوسان بوو بەکارێکی وەها رووی هاتنە ناو خەڵکی نەمابوو، ئەوەندەی نەخایاند مرد.

زەدیج لەسەر ئەو دامەزراندنەی لەو پایەدا سوپاس و ستایشی خۆی پێشکەش بەشا و شاژن کرد، ئەوجا چوو بۆ لای تووتییەکەی شا و درووود و سوپاسی بۆ نواند و وتی: ((ئەی باڵندە جوانەکە تۆ بووی منت لە مردن رزگارکرد و، وات لێ کردم ببم بە گەورەی وەزیرەکان، زەدیج چەند وەفای بۆ تووتییەکە نواند، ئەوەندەش گوێ نەدانی دەرحەق بە سەگەکەی شاژن و ماییەنەکەی شا هەبوو، رووی لە تووتییەکە کرد و وتی: ((ئەوە چ چاکەیەك بوو بە منت کرد، دیارە چارەنووسی مرۆڤ ئاوایە بەشتی بێ بایەخەوە بەندە، بەختەوەرییەك بەو جۆرە بێتە دی لەوانەیە ئەوەندە بەردەوام نەبێ)).

تووتییەکە وتی: (بەڵێ وایە).

زەدیج بە وتەی تووتییەکە، لەبەر خۆیدا داما و دەنگی نەکرد، ئەو لەسروشت و خووی زیندەوەردا شارەزایی هەبوو، لەوەش دڵنیابوو کە ئەو تووتییە وشەی (بەڵێ وایە)ی لە غەیبەوە نەهێنابوو، دوای کەمێ رامان هاتەوە سەرخۆی و متمانە و دڵنیایی بە خۆیدا هێنایەوە، چووە سەرکاروباری وەزارەتەکەی، بە ئاسانی و راست و دروستی جێبەجێی دەکردن.

زەدیج کە دەستی کرد بە راییکردنی کاروباری دەوڵەت، بۆ هەموو خەڵکی دەرخست کە قانوون سەروەرێکی گەورە و پیرۆزە، فەرمانەکانی وا رامکردن و قورساییان لەسەرشانی خەڵك نەما، رای تایبەتی خۆی بەسەر دیواندا نەدەسەپاند، هەر وەزیرێك بە ئارەزووی خۆی رای تایبەتی خۆی سەبارەت بەرووداو و فەرمانەکان دەردەبڕی بەبێ ئەوەی سەرزەنشت بکرێ، کە بۆ دادوەریکردن دادەنیشت قانوون سەروەر بوو نەك را و بۆچوونی خۆی، بەڵام ئەگەر فەرمانی قانوون بێ بەزەییانە بوایە ئەو نەرمی تیادا دەنواند، هەررووداوێکیش هەبوایە قانوون لێی بێدەنگ بوایە، زەردەشت ئاسا خۆی بە شێوەیەکی دادپەروەرانە فەرمانی دەربارەی دەردەکرد، ئەم بنەما گرینگە کە دەڵێ: ((رزگارکردنی تاوانبارێك لە حکومنەدانی بێ تاوانێك چاکترە)) میللەتان لەوەوە فێری بوون، ئەو لەو بڕوایەدا بوو قانوون بۆیە دانراوە بۆ فریاکەوتنی ژیانی هاوولاتیانە، هەروەکو چۆن بۆ ترساندنیانە.

جیاوازی زەدیج لە خەڵکانی دیکە ئەوەبوو ئەو حەقیقەتی شتەکانی وەکو خۆیان بۆ خەڵك دەردەخست لە کاتێکدا خەڵکی تر دەیان شاردنەوە.

لە کارگێری وکاروباری دەوڵەت و راست حوکمرانیدا زەدیج توانی سوود لە زیرەکی خۆی وەربگرێ، یەکێك لە بازرگانە گەورەکانی بابل لە ولاتی هیندستان بە دەردێکی کوشندە دەمرێ، زەدیج سامانی ئەو بازرگانەی بەمیرات بە شێوەیەکی یەکسانی دا بەهەردوو کوڕەکەی بەو مەرجەی مارەیی خوشکەکەیان بدەن و دایمەزرێنن، زەدیج لە سامانەکەی بازرگانەکە سی هەزار دینار زێری لای خۆی دانا بۆئەوەی بیبەخشێ بەو کوڕەی کە پتر باوکی خۆش ویستووە، کوڕە گەورەکەی بازرگانەکە، بەپارەی میراتەکە گۆڕێکی رازاوەی بۆ باوکی دروست دەکات، کوڕە بچووکەکیش لەبەشە میراتەکەی خۆی زیاتر لەبراکەی پارەی مارەیی بە خوشکەکەی دەدات، هەندێ خەڵك دەیانووت: ((کوڕە گەورەکە پتر باوکی خۆش ویستووە، کەچی هەندێکی تر دەیانووت: ((برا بچووکەکە خوشکەکەی لە باوکی خۆشتر ویستووە)).

کەواتــە حــەق وایــە ئــەو سـی هــەزار دینــارە بدرێتــە کــوڕە گەورەکـە. زەدیــج هەردووکیانی بانگ کردنە لای خۆی، هەریەك بە جیا لەبەردەم خۆیـدا رایگـرتن. بـە کوڕە گەورەکەی وت: (دەزانـی باوکـت نـەمردووە و لـەو دەردەی کـە تووشـی ببـوو رسکاوەو هاتووەتەوە).

کوڕە گەورەکە وتی: (سوپاس بۆخوا کە نەمردووە، بەلام ئەو گۆڕەی بـۆم دروسـت کردووە زۆری تێچووە). کە کوڕە بچووکەکەش لەبەر دەمیدا راوەستا، ئەوەی بـەکوڕە گەورەکەی وت بەویشی وتەوە، ئەویش وتی: ((سـوپاس بۆخـوا، کەواتـە ئـەو بەشـە میراتەی بەرم کەوتووە بۆی دەگێرمەوە، بەلام خۆزگە بـاوکم ئـەوەی بـە خوشـکەکەم بەخشیوە لێی خۆش دەبوو).

زەدیج وتی: (هیچی ناگێڕێتەوە، ئەو سی هەزار دینارەش کە ماوەتـەوە بـۆ تـۆ دەبێ، چونکە تۆ باوکت پـتر خـۆش دەوێـت). کـچێکی شـۆخی خـاوەن سـامان بـۆ فێربوونی خوێندن هامشووی دوو موغان دەکات، لەگەڵ فێربوونیدا سکیـشی بـۆ پـڕ دەکەن، کە دوو مۆغانەکە لە یەکتری ئاشکرا دەبن، هەریەك دەیەوێ کـچەکە بکـات بە هاوسەری خۆی و منداڵەش بکاتە هی خۆی، کچە بـە هـەردووکیان رادەگەیـەنێ: هەرکامێکیان توانیبێتی هاوولاتییەکی نوێ بۆ دەوڵەت بخاتەوە بەوەیان شوو دەکات و منداڵەکەش بۆ خۆی دەبات، یەکێکیان وتـی: مـن توانیومـە ئـەو منداڵـە بکـێڵم، ئەویتریش وتی: (دڵنیام ئەو هاوولاتییە تۆوی منـە و لـەمن دەوەشـێتەوە). کـچەکە وتی: (من هەردووکتان پەسند دەکەم، بەلام ئایـا کامتـان لێتـان دەوەشـێتەوە، ئـەو هاوولاتییە کـە دەبـێ بـە چـاکی پـەروەردەی بکـات). هـەردوو کاهینەکـە لەسـەر مارەکردنی ئەو ژنە و وەرگرتنی منداڵەکەی بوو بە دەمە قاڵەیان، وای لێ هات ئـەو پرسە گەیشتە لای زەدیج، ئەویش بانگی کردنە دادگا و هەریـەك بـەجیا لەبـەر دەم خۆیدا رایگرتن و پرسیاری لێ کردن زەدیج بە یەکەمیانی وت: (ئەگەر ئەو منداڵە بۆ تۆ بێ چی فێر دەکەی؟ کاهینەکە وتی: (فێری وتاریـژی و لۆجیـك و فەلەکناسـی و خەسڵەتەکانی ئەهرۆ مەزدای دەکەم، هەروەها فێـری حەقیقـەتی جەوهـەر و وارس و

مانای ئەبستراکەکان و شتە ئاوێتەکان و ئەو رەوشتانە کە گەردوونیان لێ پێك هاتووە دەکەم، وە هەروەها فێری ئەو یاسایانەی دەکەم بەر لە قەزا کەوتوون. کاهینی دووەمیش وتی: (هەوڵ دەدەم فێری یاساناسی و یەکسانی و دادپەروەری و راستگۆیی بکەم) زەدیج وتی:

(تۆ چ باوکی ئەو منداڵە بی یان ئەو نەبی دایکی بۆتۆیە، تۆ مارەی دەکەیت). خەڵکی دەڤەری میدیا گەلێ جار سکالای خۆیان لەدەست میرەکەیان کە ناوی (ئیراکس) بوو بەزەدیج گەیاندبوو، ئەو میرە هەرچەندە لە هەندێ رووەوە شتی لە پیاوێکی رەند و جوامێر و خۆش خوان دەچوو کەچی لە چلێسیدا لە کۆتر چلێستربوو، لە تەنبەڵیدا لە کیسەڵ سست و تەنبەڵتر بوو، لەفیز و لە خۆبایی بووندا لە تاوس لە خۆبایی تر بوو، کەس یارای ئەوەی نەبوو لە روویدا راوەستێ، دەرفەتی کەسی نەدەدا قسە بخاتە بەر قسەی. بە چلێسی و فرە چێژییەوە خۆی هەڵ دەکێشا، خۆی بە هێژا و شکۆدار دەزانی کەچی هیچی لەباردا نەبوو، زەدیج ویستی لەو عەیبانە پاکی بکاتەوە بەفەرمانی شا تیپێکی لە دوانزە سترانبێژ پێکهێنا، بیست و چوار سەماکەر و چۆپی کێش و دەهۆڵ کوت، بەسەرۆکایەتی یەکێ لە مۆسیقاژەنە ناودارەکان، لەگەڵ ئەوانیشدا کەسێکی خزمەتگوزاری و کارامە و شەش کارمەند و چوار دەرگاوانی دانا، پێکهێنانی ئەو تیپە بۆ ئەوەبوو برۆن بۆ لای (ئیراکس).

بە پێی ئەو پرۆگرامە کە بۆیان دانرابوون، بەدەوریا بسوورێنەوە و بۆی بژەنن، بە فەرمانی شا نەدەبوو ئەو پرۆگرامە بێ کەم و زیاد جێبەجێ بکرێ بەم جۆرە جێبەجێ کرا، لەرۆژی یەکەمدا هێشتا (ئیراکس) بە تەواوی خەو بەری نەدابوو، سەرۆکی مۆسیقاژەنەکان و گۆرانیبێژەکان و دهۆڵ کوتەکان لێی چوونە ژوورەوە، گۆرانییەکی دووکاتژمێرییان بۆ چری، هەرسی خولەك جارێ ئەم برگانەی گۆرانییەکە دووپات دەکرانەوە:

چەند وتەیەکی بە جۆشە

ئای چەند خۆشە

گەورەمان شایستەیە
ببێ سولّتانی مەی نۆشان
ئای چەند بۆمان
سەرفرازییە، سالارمان
بەردەوام بێ، لەسەر نۆشان.

کە گۆرانی بێژەکان لێ دەبوونەوە، بە گورجی یەکێك لە دەرگاوانەکانی لەبەر دەمیدا قیت رادەوەستا و بە زمانێکی لووس وتارێکی سێ چارەك کاتژمێری پڕ دوو رۆیی بۆ دەخوێندەوە و ساوی دەدا، کە وتارەکە تەواو دەبوو لەسەر ئاوازی مۆسیقا دەچووە سەرخوانی نان خواردن و بەزمی هەی نۆش هەی نۆشی بۆ دەژەنرا، لەمە وتەیەك لەدەمی دەهاتە دەرەوە، دەرگاوانی یەکەم لە پشت ملی خۆی دەدا و دەیووت ((بەگەردنم وتەی راست هەبێ ئەوەیە)). دەرگاوانەکانی تر دەیاندایە قاقای پێکەنین، کە لەسەر خوانەکە هەلّدەسا، مۆسیقاژەنەکان ریزیان دەپێکا و بە چەشنی پێشوو گۆرانییەکەیان بە مۆسیقا بۆ دەژەندەوە. (ئیراکیس) لە خۆی رازی بوو، لە دلّی خۆیدا والێکی دەدایەوە کە ئەوە خەلاّت و بەراتی شایە، پاداشی چاکەکانی دەداتەوە. لە رۆژی یەکەمدا گەلێ چێژی لەو بەزمە وەرگرت، لە رۆژی دووەمدا چێژەکە لە کەمی داو وەکو رۆژی یەکەم نەما، لە رۆژی سێیەمدا ئەو بەزمەی لا تالّ بوو، لە رۆژی چوارەمدا لێی بێزاربوو، لە رۆژی پێنچەمدا هەستی کرد ئازار و دەردێکی گرانی بۆ سازدراوە، بە تایبەتی ئەو پەیڤە ((چەند وتەیەکی بەچۆشە)) ئەو کات زانی مانای چییە و چی دەهاوێ، هەستی کرد وشەی ((بە گەرم راست هەبێ ئەوەیە)) بزمارە و لە سنگی دەچەقێ، با کەف چرینی لاکە لاوەی ئەو وتاربێژە راوەستێ، وای دەزانی تف لە دەم وچاوی دەکات، چارەی نەما ئەوە نەبێ نامەیەکی بەپەلەی بەم جۆرە بۆ شا بنووسێ: ((خاوەن شکۆ سوپاسی لوتفتان دەکەم، فەرمان بفەرموون: ئەو تیپە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژ و دەرگاوانانە بگەڕێنەوە)). پەیمانی دا لەمەو دوا لە خۆبایی

نەبێ، بە چالاکانە کاربکات، ئیدی لەوکاتەوە وازی لە ستایشی پڕ درۆ و ریـا هێنـا، بەختەوەر بوو. ((لە کتێبی پیرۆزی بەراهمەکاندا)) هاتووە: (چێژی بەردەوام چێژ نییە) زەدیج لە نێوان کاهینە سپی رەنـگ و رەشـەکاندا بـە ئاسـانی ژیـانی دەگوزەرانـد. کاهینە سپییەکان بڕوایان وابوو ئەوەی کە لە زستاندا نوێژ دەکات نوێژی بەتاڵە ئەگەر لەکاتی نوێژدا روو لە رۆژهەلاّت بکات، کاهینە رەشـەکانیش دەیـانووت خـوا رکـی لەوانە دەبێتەوە کەلە هاویندا نوێژ دەکەن روو بکەنە رۆژئاوا).

* * *

## پێشوازی و دوژمنکاری

ڕۆژ بە ڕۆژ زیرەکی و جوامێری و سەلاری زەدیج بۆ خەڵك دەردەکەوت، لای خەڵك خۆشەویستر دەبوو، سەریان لە ڕاستگۆیی و فەرمانڕەواییە پڕ بە دادوەریکەی سوڕمابوو، ناوی لەسەر زاری هەموان بوو، ژنان بە تاسەوی بینینی بوون، هۆشیاری ئەو نموونەی بڵندی هۆشیار بوو، زانایان بە سەرچاوەی سروشتی خۆیان دەزانی، کاهینەکان لەو بروایەدابوون کە زانیاری زەدیج گەلێ لە زانیاری پیری گەورەیان (بەیبور) فراوانترە، پرسەکەی عەنقایان لەبیر خۆ برد بووە وە، ئەوەی زەدیج پێی پەسند نەبوایە لای کەس پەسند نەبوو.

هەر لەکۆنەوە لەولاتی بابلدا دوژمندارییەکی کۆن لە ناو خەلکدا ڕەگی داکوتابوو، ئەو دوژمندارییە نزیکەی چواردە سەدە درێژەی کێشابوو، بەو دوژمندارییە دەوڵەت ببوو بە دوو بەشی دژ بە یەك: بەشێکیان لەو باوەرە دا بوون: ئەگەر یەکێك بیەوێت بچێتە ناو پەرستگای (میترا)وە دەبێ پێی چەپی لە پێشەوە بخاتە ناوی، دەنا چونەکەی حەرامە و دروست نییە! بەشەکەی تریان رایان پێچەوانەی ڕای یەکەم بوو. هەر بەشێك ڕاکەی بەشەکەی تری بە گومڕایی دەزانی. خەلکەکە هەموو چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی جەژنیان دەکرد تا بۆیان دەربکەوێ کە ئایا زەدیج لەسەرکام لەو دوو ڕێبازەیە. لە بەیانی ڕۆژی جەژنەوە خەلکەکە ئارامیان لێ بڕا و چاویان لە هەردوو پێی زەدیج بوو، کەچی ئەو کە چووە ناو پەرستگاکە، لەبەر دەرگاوە بازی دایە ناوی، نەچەپەی پێش خست نە ڕاستەی، ئەوجا وتارێکی بۆ مەردوومەکە خوێندەوە و وتی:

خوای خاوەن گەردوون کەسێکی لە کەسێکی تر بەگەورە و پایەدار نەزانیوە، هیچ لاقێکی مرۆڤی لەویتر پێ باشتر نەبووە، کابرایەکی ڕژد و ژنەکەی ڕەخنەیان لە وتارەکەی زەدیج دەگرت، دەیانووت: ئەوەندە ڕەوانبێژی تیا بەکار نەهاتبوو، چیا و

زوورگەکانی نەخستە سەما، وتارێکی وشك و لاواز بوو، وایان دەزانی دەبێ وتاری زەدیج لە گەرمیدا دەریا وشك بکات و ئەستێرەکان بۆی بێنە خوارەوە، لە تیندا ڕۆژ وەکو مۆم بۆی بتوێتەوە، کوا بەجوان و پتەوی دانەرێژرابوو! زەدیج هەر ئەوەندەی لا مەبەست بوو وتارەکەی دەربری هۆش و دەروونی بوو، لەو کاتەوە خەڵك شێوازی ئەو وتارەیان کرد بە ڕەویە و ڕێبازی خۆیان، نەك لەبەر ئەوەی چونکە وتاری وەزیری یەکەم بوو.

زەدیج فەرمانی دا: ئەوەی لە نوێژکردندا روو لە هەرلایەك بکات بەئارەزووی خۆیەتی. زەدیج کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدەدا، نەخشەی بۆ کارەکانی دانابوو، سەرلەبەیانیان کار و فەرمانە تایبەتی و گشتییەکانی رادەپەراند، ئەوەی دەمایەوە لە جوانکاری شاری بابلدا تەواوی دەکرد، لەبەر ئەوەی هەست ناسك و هونەردۆست بوو، نواندنی کارەساتە تراژیدییەکان و کۆمیدییەکان کە ماوەیەك بوو نواندنیان پشت گوێ خرابوو، فەرمانی دا هونەری نواندن سەرلەنوێ زیندوو بکرێتەوە. ئەو لە هونەردا خۆی لە هونەرمەندان بالاتر نەدەزانی، بۆیە ڕێزی لێ دەنان و خەلات و بەراتی دەدانێ. دانی ئێوارانی بۆ رابواردنی شاژن تەرخان کردبوو، شا ناوی نابوو وەزیری یەکەم، شاژنیش ناوی نابوو وەزیری جوان، هەردووکیان پێیان وابوو بە ئەمانی ئەو دەوڵەت تووشی کارەسات دەبێ.

هیچ وەزیرێك وەکو ئەو بۆی نەلوابوو ئەوەندە پێشوازی لە ژنان بکات، چوونەکەیان مەبەستێکی بایەخداری نەدەگەیاند، ئەوەی دەیانووت تەنیا وتەی تفت و کرچ وکاڵ بوون، ژنی کابرای رژدە بۆچوونە لای سەرتیپی ئەو ژنانە بوو، لێی چووە پێشەوە و سوێندی بە (میترا) و زەند ئاوێستا و ئاگری پیرۆزی خوایی خوارد کە چارەی مێردەکەی نەویستووە و رکی لە رەفتارەکانی بووەتەوە، لە پەنای وتەکانیدا ئەوەی درکان کە مێردەکەی لێی بە گومانە و دڵ پیسە، وتیشی کە خواکان لەسەر ئەو رەفتارانەی سزای دەدەن و لەپایەی نەمران دووری دەخەنەوە، ژنی کابرای رژدە بەدەم قسەکردنەوە قەیتانی پوزەوانەکەی خۆی شل کرد و بەری

دایەوە، زەدیج بە نەزاکەت و نیانییەوە هەڵی گرتەوە و پێیدایەوە، بەدەور پووزی ژنەکەدا نەیپێچایەوە، ئەمە لەسەری بە هەڵە نەژمارکرا، هەر ئەو هەڵەیە — ئەگەر هەڵە بێ — تووشی تەنگ و چەڵەمەی کرد، زەدیج بیری بەلای ئەوەدا نەچوو کە هەڵەی کردبێ کەچی ژنی کابرای رژدە کردی بە تۆڕی گرفتار بوون بۆ زەدیج.

ژنەکەی کابرای رژدە وای کرد کە خانمانی بابل هەموو رۆژێ سەردانی بکەن، مێژووی نهێنی شاری بابل کەتنێکی لەسەر تۆمارکرد، خۆشی لە کەتنەکەی سەرسام بوو، چ چێژێکی جیاوازی ئەوتۆی لێ نەکرد، ئەو ئافرەتەی کەتنەکەی سەرتۆمارکرد، کەس ئاوری لێ نەدابووە وە یەکێك بوو لە کەنیزەکانی شاژن (ئەستارتیە). ئەو ژنە لەناو ئافرەتاندا خۆی هەڵ کێشابوو، وتبووی: (دیارە ئەو پیاوە غەم و پەژارەیەکی زۆری بەکۆڵ خۆیدا داوە، تەنانەت لەکات جووت بوونیشدا بیری لای پەژارەکانیەتی لەو ساتەدا کە کەس دەمی ناکرێتەوە شتێ بڵێ ئەو ناوی (شاژن)ی دەهێنا).

زەدیج وەك ورێنە بکات ناوی شاژن (ئەستارتیە) بە دەمیدا هات، ژنەکە لە ساتی چێژ وەرگرتندا بوو، وای دەزانی پێی دەڵێ (لە شاژن ئەستارتیە جوانتری). ژنەکە شادمان بوو کە لە کۆشکی زەدیج هاتە دەرەوە یەکسەر چوو بۆلای ژنی کابرای رژدە چونکە دەستە خوشکی بوو، رابواردنەکەی خۆی لەگەڵ زەدیجدا بۆ گێرایەوە، کە ئەوەی بیست گڕی ئیرەتی تێبەر بوو، چونکە ئەوی پەسەند نەکردبوو، وتی (ئەو پیاوە کە قەیتانی پووزەوانەکەی من کەوت دانە نەوییەوە بەدەور پووزمدا بیبەستێیەوە)، لەو رۆژەوە ئەو قەیتانەشم لەبەرچاو کەوتووە. ژنە شادمانەکە، کە چاوی بە قەیتانی پووزەوانەکەی ژنەی رژدەکە کەوت وتی: (نۆ: قەیتانی پووزەوانەکانت لە قەیتانی پووزەوانەکانی شاژن دەچێ، رەنگە هەردووکتان یەك ئۆستا بۆتان بچنێ).

ژنەی رژدە هیچی نەووت: راما و کەوتە ناو بیرکردنەوە، لە پاشدا رووداوەکەی بۆ مێردەکەی گێرایەوە. لەوکاتەوە زەدیج تووشی جۆرە وڕییەك ببوو، نەیدەزانی

هۆی ئەو وڕییەی چییە. لە خەوندا خۆی دی لەسەر پووشی دڕکاوی ڕاکشاوە و دڕکەکانی لە لاشەی دەچەقن و ئازاری دەدەن.. دوای ئەوە هەر لە خەوندا دی وا لە ناو کۆشەیەکی گوڵاویدا نووستووە لەناکاو لەناو گوڵەکاندا مارێك هاتەدەر بەدەم و زمانێکی باریك سەری دڵی گەست. دوای ئەو خەونە بەخۆی دەووت: ((ئای بەداخەوە! گەلێ لەسەر پووشی پڕ لە دڕك خەوتووم، ئەوەتا ئێستا لەسەر سەریری گوڵێن دەخەوم، داخۆ مانای ئەو مارە چی بێ ؟)).

* * *

## غیرەت

لە ناو بەختەوەرییەکەی زەدیج دا نەگبەتی و نەهامەتی خۆیان مەڵاس دابوو، بە تایبەتی سەلاری و کارامییەکەی زەمینەی بۆ زوو هاتنە دییان خۆش کردبوو، هەموو رۆژێ بە تەنیا لەگەڵ شا و شاژنە نازدارەکەی کۆدەبووەوە، قسەی بە تام و پەندی پڕ بە حیکمەتی وەهای بۆدەگێڕانەوە سەرسام دەبوون، وتە پڕماناکانی و جوانی تافی گەنجییەتەکەی لە ناخی ئەستارتیەدا بە ئەستەم تۆوی ئەڤینیان دەچاند، ئەستارتیە بێباکانە لە کاتی گوێگرتن لە وتەکانی زەدیج سەیری نێو نیگای دەکرد، لە روانینـدا چاوی لێک لا نەدەکرد، بەبێ ترس لای شا ناوی دەهێنا، هەروەها لای کەنیزەکەکانیش باسی سەلارییەکەی دەکرد، ئەو کەنیزەکانە کەهەر وتەیەکیان گوێ لێ بوایە شان و باڵیان بۆ دروست دەکرد، شتەکان هەموو رێگەیان بۆ ئەو تیرە دەست نیشان دەکرد، کە بەبێ ئەوەی ئەستاتیە هەست بکات دەچەقییە ناو دڵی، ئەو خەلاتانەی کە پێشکەش زەدیجی دەکردن پتر ئەوەیان دەگەیاند کە مەیلی لایەتی نەک رێزلێنان.

خۆی وا تێگەیاندبوو: کە قسەی لەتەکدا دەکات وەکو شاژنێك لەگەڵ وەزیرێکدا قسە دەکات، کەچی قسەکانی لەگەڵیدا لە وتەی ژنێکی هەست ناسك دەچوو، گومان لەوەدا نەبوو کە ئەستارتیە لە جوانی و شۆخیدا گەلێ لە (پەریزاد) جوانتر بوو، ئەو (پەریزاد)ە کە حەزی لە پیاوی چاوکوێر نەبوو، لەو ئافرەتەش کە دەیویست لووتی ببڕێ نازدارتربوو، کوا ئەوە و کوا ئەو نێو نیگا پاکەی ئەستارتیە، ئەو نێو نێگا پاکەی کە بە وشە ناسکەکانی وەکو پەڕەی گوڵ سوور هەڵدەگەڕا، هەرچەند هەوڵی دەدا ناو دڵی لەسەر روومەتی رەنگ نەداتەوە نەیدەتوانی، ئەو سووربوونەوە بوو بە بروسکەی ئاگرێك گڕی بەردایە ناو دەروونی زەدیج.

زەدیج بێ وچان هەوڵی دا نەهێڵێ ئەو ئاگرە لە ناو دەروونیدا پەرە بسێنێ، بەڵام هەوڵدانەکەی بێ سوود بوو، پەنای بردە بەر فەلسەفە کە هەمەدەم یارمەتی دەری بوو، فێری هەندێ زانینی کرد بەڵام دەسەڵاتی بەسەر مەملەکەتی عیشقدا نەدەشکا هەمیشە لەناو هۆشیدا ئەرکەکانی سەرشانی، پێزانینی ئەو چاکانە بوون کە دەربارەی کرابوون بە شکۆمەندی شا بەرجەستە دەبوون و وەکو خواکانی سزادان سەرزەنشتیان دەکرد و چنگیان لە ناخی گیر دەکرد، کەوتبووە ناو جەنگێکی نا هەموارەوە.

بە هەموو هێزی خۆی هەوڵی دەدا لەو جەنگە دا سەرکەوتن بەدەست بینێ، بەڵام لە کاتی سەرکەوتندا چاوی پڕ فرمێسک دەبوون، دەروونی دەستی بە ناڵین دەکرد، لەبەردەم شاژنیشدا پەردەیەك بەسەر دیدیدا دەدرا و وتەکانی پچڕ پچڕ دەبوون شتی پێ نەدەووترا، لە ئاستیدا چاوی دادەخست، کە دەیکردەوە دەیبینی هەردووچاوی لە ناو فرمێسکدا نوقومن و تیری ئاگراوی بۆ دەهاوێن. لەو ساتانەدا زمان حاڵی هەر یەکێکیان بەویتری دەووت: (تیری عیشق هەردووکمانی پێکاوە کەچی خۆمانی لێ دەپارێزین). کە زەدیج لە کۆبوونەوەکانی ئەستارتیە دەهاتە دەرەوە، وڕ و بێدەنگ دەبوو، وتەی لەگەڵ کەسدا پێ نەدەکرا، وەك بڵێی بەردە ئاشێکی قورس بە کۆڵیدا دراوە و لە ژێریدا دەرناچێ، وا گرفتاری ئەڤینی ئەستارتیە ببوو، هەموو هەست و ویستێکی لەدەست دەرچوو بوو، بۆ چارەسەرێ پەنای بردە بەر برادەرە خۆشەویستەکەی (کادۆر) ئەو پەنا بردنەی وەکو ئەوەبوو یەکێك دڕکێك بە لەشیدا چەقی بێ و ئازارەکەی لە خەڵك شاردبێتەوە، بەڵام لەکاتی دەرهێنانی دڕکەکە یەك هاواری لێ بەرز دەبێتەوە.

(کادۆر) وتی: ((ئەی برای ئازیزم ئەو سۆزە ئاسکەی کە دەتویست لە خەڵکی بشارێتەوە بەو هەموو فەلسەفە و توانـاوە خۆت لە بەر پەنگدانەوەیدا نەگرت و تەقییەوە، گڕی دڵی دڵداران بەکەس خەفە ناکرێ و شاردنەوەی بۆ نییە. ئەی برای ئازیزم ئەوەی لە ناو دڵتا حەشارت دابوو من لە زووەوە خوێندوومەتەوە، ئەوەی لە دڵتایە سووکایەتییە بۆ شا. ئەگەر بیخوێنێتەوە داخۆ چی رووبدات، خۆ تاکە

خەسڵەتی خراپەی شا ئەوەیە زۆر بە غیرەتە، ئەوەندەی تـۆ پێـت دەکـرێ بـەرەنگاری هەرەسی ئەو خۆشەویستییە بکەی، ئەستارتیە ئەو بەرەنگارییەی پێ ناکرێ چونکە تۆ فەیلەسووفی، زەدیجی، توانات پترە، بەڵام ئەستارتیە ژنە لەوانەیە بەبێ تـرس ئـەوەی لە دڵیایەتی بیدرکێنێ وا بزانـێ لـەپاڵ پـاك و بێگـەردی خۆیـدا شـتی لێ نـاگیرێ، بەراستی من لەبەر خۆمەوە بەزەییم بە ئەستارتیە دا دێتـەوە رەنگـە بـە بێتـاوانی و پاکی خۆیدا بنازێ و بزانێ کەس ناتوانێ زمانی لێ بدات.

خـۆ ئەگـەر لـە نێـوان خۆتانـدا رێککـەوتنێکتان هەبوایـە، لەچـاو و زاران دووردەکەوتنەوە، چونکە هەر خۆشەویستییەك رەزامەنـدی هـەردوو دڵـدار داپۆشـێ سەلامەت دەبی)). زەدیج بەو بیرۆکەیە کە (کادۆر) لەناو قسەکانیدا ئامـاژەی پێـدا تووشی شۆك بوو، چونکە بیرۆکەکە هەڵی دەنا ناپاکی دەربارەی شـا و لەکـەدارکردنی ناموسی بکات، ئەی ئەوە ئەو شایە  نەبوو چاکەی لە تەکدا کـرد و کردیـە وەزیـری یەکەم، لەو رۆژەوە  بەو دەردەوە گرفتار ببوو لەهەموو کاتێ پتر خـۆی بـە وەفـاداری کۆشك دەزانی، زەدیج بە ئامادەبوونی شا کـە نـاوی شـا ژنـی دەهێنـا وەکـو نـاوی دۆستێکی بینێ وابوو، کەچی شـا بـۆی دادەپۆشـی و نیازپـاکی بـۆی لێکدەدایـەوە، شاژنیش بـە نـارەزووی خـۆی نـاوی زەدیجـی دەهێنـا بـەناو هێنـانی نیگـای سـوور هەڵدەگەرا، ناو هێنانەکەی جاروبار گرژی تێدەکەوت و دەپچرا، لە چڤاتەکانیدا کـە هەڵدەسا و دەرۆی وا دادەما و نوقمی ناو خەیاڵی دەبوو، شایش هەستی بەوە کردبـوو کە ناوی زەدیج دەبرا، ئەو روومەتی وەکو سکڵی سووری لێ دەهات.

ئەو هەموو نیشانانە شا یـان تووشـی گومـان و ئەسـرەوتی کردبـوو، لـە پاشـدا گومانەکەی لێ بوو بە یەقین، خەیاڵەکانی لە مێشکدا کەڵەکەیان کرد، بەتایبەتی کە دی پێڵاوی ژنەکەی وەك پێڵاوەکانی زەدیج رەنگیان شین بوو. هەروەها قەیتان بەنـدی جلەکانی وەکو قەیتانی کڵاوەکەی زەدیـج زەرد بـوون، ئەوانـە هـەموو بەڵگـە بـوون یەقینیان لە هۆشی شادا بێ گومان دەکرد و لـەناو دڵیـدا رکیـان ئەسـتوور دەکـرد. هەمیشە خزمەتکار و کەنیزەکی ناو کۆشکی شاهانە چاو گوێی ناو دڵی شا و شاژنن،

ئەوانە دەمێك بوو زانیبوویان کە ئەستارتیە عاشیقە و شا (مویەردار) یش هەموو گیانی زات و غیرەتە.

لەوساتەدا کابرای ڕژدە هانی ژنەکەی خۆی دا کە قەیتانی پووزەوانەکەی خۆی کە ڕەنگی قەیتانی پووزەوانەکەی شاژن بوو بۆ شای بنێرێ، ئەو قەیتانە زەردە بوو دەرگای نەهامەتی بۆ زەدیج کردەوە.

ئیدی شا جگە لە سزادان بیری بەلای هیچ شتێکی تردا نەچوو، بڕیار هاتە سەر ئەوە شاژن ژەهری دەرخوارد بدرێ و بمرێ زەدیجیش لە بەیانی ئەو شەوەدا سەری بە پەتدا بکرێ و هەڵواسرێ، فەرمانی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە درا بەو زەلامە کە یەکێك بوو لە پیاوە خەسیاوەکانی ناو کۆشك کە زەلامێکی دڵڕەق و کینە لە دڵ بوو.

یەکێك لە پیاوە کورتیلەکانی ناو کۆشك کە وەکو ئاژەڵێکیماڵی وابوو، هیچی لێ نەدەشاردرایەوە، ئەو کورتیلە لاڵ بوو بەلاّم دەیبیست، لە کەنارێکی ئەو چڤاتەدا هەڵ تووتابوو. گوێی لە فەرمانەکانی شا دەبێ، ئەو پیاوە گەڵێ شاژن و زەدیجی خۆش دەویستن، کە گوێی لەو فەرمانە دەبی نۆقرەی لێ دەبڕێ. دەیزانی چەند ساتێکی تر ئەوپەری بەیانی ئەو ڕۆژەیە ئەو دوانە دەکوژرێن، چون فریایان بکەوێ، زمانی لاڵە و کەس لێی تێناگات و نووسین نازانێ بەلاّم وێنەکێشی چاك بوو دەیتوانی ئەوەی بە زمان پێی ناوترێ بە وێنە بەرجەستەی بکات، تابلۆیەکی هێنا لە سووچێکەوە وێنەی شای بە ڕوویێکی تووڕە و کرژەوە کێشا، کە شا فەرمانی بە کابرای خەسیاو داوە، لەو لاشەوە خوانێك و پەت و پووز پێچێکی شین و قەیتانێکی زەرد بوون لە ناویاندا کوچەڵەیەکی پڕبەشت دانرابوو، لە ناوەڕاستی تابلۆکەدا شاژن لەبەر دەست کارەکەر و کەنیزەکاندا ڕاکشابوو گیان کەنشتی دەکرد، زەدیجیش لەبەر پێیدا خنکێنرابوو، ئاسۆی ناو تابلۆکە کاتی هەڵهاتنی خۆری نیشان دەدا، ئەوە بەڵگەبوو کە تا ئەوکات ئەو شتانە ڕوو دەدەن، کە تابلۆکەی تەواو کرد، بە خێرایی چوو بۆ لای یەکێك لە کارەکەرەکان و تێی گەیاند کە بەگوڕجی ئەو تابلۆیە بە شاژن بگەیەنێ.

لەنیوەی شەودا بە توندی لە دەرگای زەدیج درا، لەخەو هەڵسێنرا و نامەیەکی شاژنی درایە دەست، کە سەیری کرد دەستی کەوتە لەرزین و رنگی تێکچوو، کە نامەکەی کردەوە سەرسام بوو، وەك لەقەلایەکی سەختەوە بەربێتەوە، نامەکە، بەم جۆرە نووسرابوو: (تا زووە فریای خۆت بکەوە، دەنا بەم زوانە ژیانت لەدەست دەدەی.. زەدیج فریای خۆت کەوە، من پێت دەڵێم، سوێندت بە خۆشەویستی پاکمان و قەیناکە زەرەرەکان دەدەم، من خۆم بە تاوانبار نازانم کەچی وادیارە بە تۆمەتی خراپەکاری دەکوژرێم).

زەدیج توانای لەسەر قسەکردن نەمابوو، داوای ئامادەبوونی (کادۆر)ی برادەری کرد، کە هات هیچی پێ نەووت، تەنیا نامەکەی شاژنی خستە بەردەمی. (کادۆر) کە نامەکەی خوێندەوە لێی چووە پێشەوە و پێی وت: تکات لێ دەکەم چیت پێ دەڵێم بیکە، هەر ئێستا خۆت دەربازکە و بەرەو (مەمفیس) رێگە بگرە بەر.

ئەوجا وتی: ئێستا لەم حاڵەتەدا من چیم پێدەکرێ، ئەگەر دەچم بۆ لای شاژن مانای وایە لە مردن نزیکی دەکەمەوە، ئەگەر دەشچم بۆلای شا هەمدیسان هەر لە مردن نزیکی دەکەمەوە، زەدیج تۆ فریای خۆت کەوە و برۆ، چارەیەکیش بۆئەو دەدۆزینەوە. هەرلەو کاتەوە دوو وشتری خۆش رەوتی هێنان، زەدیج و یەکێك لە نۆکەرەکانی سواربوون و بەرەو ولاتی میسر تێیان تەقاند، (کادۆر) تێی گەیاند کە ئەگەر لێیان پرسی دەڵێ: بەرەو هیندستان رای کردووە، لە دواییشدا ئەویش بە شوێنیدا دەڕوا بۆ ئەوەی دوای ئەو چی روو دەدات ئاگاداری بکاتەوە).

بە رۆیشتنی زەدیج کادۆر کەوتە خەمێکی قووڵەوە. زەدیج رۆیشت تا گەیشتە سەر تەپۆلکەیەك کە بەسەر شاری بابلدا دەیڕوانی و کۆشکی شاژنیشی لێوە دیاربوو، لە وشترەکەی هاتە خوارەوە، بەرەو کۆشکەکانی شاژن دەیڕوانی لەپڕ بەسەردەما کەوت و بێهۆش بوو، کە بەئاگا هاتەوە دی نۆکەرە دڵسۆزەکەی لەسەریەتی فرمێسکەکانی دەسرێتەوە، لەدڵ خۆیدا دەیووت: داخۆ ئەو شاژنە بێگوناحە، ئەو شاژنە بەناو بانگە چی بەسەردا هاتبێ! بۆ بەهۆی منەوە ئەو نەهامەتییە بەسەر ئەو

دابێ، چ ڕەوایە ژنێکی بێگوناح بە ناحەق بکوژرێ. ئەوجا حاڵی خۆی دایە بـە بـیری خۆی و هاواری کرد و وتی:

(داخۆ ژیان چ مانایەکی هەبێ؟ چاکە و ڕەوشـت باشـی چ سـوودێکیان بـۆ مـن هەبوو، لەمەو پێش دوو ژن ناپاکییان دەربارەم کرد، ئەمـە ژنـی سـێیەم بـوو، هـیچ گوناح و تاوانێکی نەبوو، کەچی فەرمانی مردنی بەسـەردا درا، چـاکەکانم بـوون بـە خراپە بۆم، لە پایەیەکدا کە بەرزی کردوومەتەوە بۆ ئەوە بووە بۆ ناو چاڵێکی تاریـک بەرم بداتەوە! ئەگەر مـنیش وەکو خەڵك شەڕاوی بوومایە هەڵبەتە بەختیار دەبووم).

بەبارێ نەهامەتی و غەم و پەژارەوە ڕێی بەرەو وڵاتی میسری گرتە بەر، ئـازار و کڵۆڵییەکەی ببوون بە تەم بەر چاوی لێل کردبـوو، ڕوومـەتی نیـشانەی مردوانـی لێ نیشتبوو، هەراسانی و بێزاری دەیانویست بیخەنە ناو خەرەندێکی قووڵەوە.

* * *

# ژنە لێدراوەکە

زەدیج بەرەو میسر ملی بە بیابانەوە نا، بەرۆژ خۆر هەڵهاتن، بەرەو رۆژئاوا رێنمایی دەکرد، بە شەویش ئەستێرەی گەلاوێژ و قوتب دەبوونە نیشاندەری رێی، کە لە ئەستێرەکانی ئاسمان ورد دەبووەوە وەکو کۆمەڵە مرواریيەکی پـژاوی بریسکەدار دەهاتنە بەرچاوی و رووناکییان بۆ سەرزەوی رەوانە دەکرد و لە ناو ئاسمانی بێسنووردا دەخوولانەوە، کە ئەم زەوییە پان و بەرینەیشی بە خەیاڵی خۆیدا دەهێنا کۆمەڵانی ئادەمیزادی بەگەلە ئاژەڵێکی خوێنمژ دەهاتنە بەرچاو کە هەندێکیان ئەوانی دیکەیان لەسەر مشتە خۆڵێك مەحف دەکەنەوە، کە ئەو بیرانەی بە خەیاڵی خۆیدا دەهێنا لە نەهامەتییەکانی خۆی دوور دەکەوتەوە، یان بە گەمەیەکی بێنرخ دەهاتنە بەرچاوی، هەموو گێتی و ولاتی بابلی لێ دەبوونە مەیدانی کایەیەکی بێ مانا.

بەو بیرۆکە وردانە دەروونی لە جەستەی جیا دەبووەوە بە ناو گەردوونێکی بێپایاندا دەسووڕایەوە، بەو گەردوونە سەرسام دەبوو کە بە یاسایەکی وەها بەند بوو، هۆشی مرۆڤی تووشی سەرگەردانی دەکرد، کە دەروونی دەگەڕایەوە ناو قەبارەکەی خەیاڵی دەچووە وە سەر ئەستارتیە و دەیووت: داخۆ ئێستا تاڵاوی مردن چ جۆرە ئازارێکی دەرخوارد دابێ، داخۆ چۆن رووبەڕووی مردن بووبێتەوە، چۆن هاواری کردبێ و چی وتبێ؟ لەناو ئەو خەیالاتانەدا جیهانی لەبەر چاو دەکەوت، ئەوەی هەبوو تەنیا ئەستارتیە بوو، گیانی دەدا، زەدیجیش تاڵاوی ژیانی دەنۆشی.

لە نێوان ئەندێشەی نەرمی فەلسەفە و جەنگەڵستانی دڕك و ئازاردا دەرۆیشت وردە وردە لەسنووری ولاتی میسر نزیك دەبووە وە، کە گەیشتە ئەوەێ لە پێشەوە نۆکەرە دڵسۆزەکەی رەوانە کرد بۆ ئەوەی شوێنێك بۆ نیشتەنییان دیاری بکات، خۆیشی لە ناو کێڵگەیەکی پڕ لە دار و درەختدا پیاسەی دەکرد، کەمێ دوور لەوێوە دی ئەوە ژنێکی شۆخە بەرەو ئەو دێت و هاوار دەکات، یەکێك فریای بکەوێ، ئەوەتا

پیاوێکی تووڕە شوێنی کەوتووە، کە پیاوەکە گەیشتە لای گرتی و دایە بەر لەق لێدان، ژنەکە هاواری بردە لای زەدیج کە لە دەست ئەو پیاوە رزگاری بکات، زەدیج حالەتی ئەو ژن و پیاوەی وا هەڵسەنگان، کە ئەو پیاوە مێردی ئەو ژنەیە و ناپاکی کردووە بۆیە غیرەتی هەڵساوە لێی دەدات، ژنەکە هاواری لە زەدیج کرد کە لەو پیاوە دڵڕەقە رزگاری بکات، ئەویش کە لێی نزیک بووەوە دی ژنێکی جوان و دڵڕفێنە، لەدەر و دیمەنیدا نەستارتیەی بەدی کرد، بۆیە دڵی پێ سووتا و خۆی خستە بەینیانەوە، هەندێ لە زمانی میسری دەزانی بە کابرای وت:

((ئەگەر کەمێ بەزەیی لە دڵتا هەیە تکات لێ دەکەم هەندێ بەزەییت بە جوانی و بێدەسەلاتی ئەو ئافرەتە دا بێتەوە، ئەوە چۆن دڵت رێ دەدا ئەو جۆرە بێ رێزییە دەربارەی ئەو ژنە بکەی کە دەسەو داوێنت بووە، جگە لە فرمێسك هیچ توانایەکی تری نییە)).

پیاوە رووگرژەکە لە زەدیج مۆڕ بووە وتی: ((وادیارە تۆش خۆشت دەوێ، کەواتە بۆم هەیە تۆڵەش لەتۆ بکەمەوە)) وای وت و پرچی ژنەکەی بەردا و نووکی نێزەکەی ئاراستەی سەر سنگی زەدیج کرد، ئەویش بەبێ ئەوەی بشێوێ توانی بە ئاسانی خۆی لەسەرە نێزەکە لابدات و بەتوندی گرتی و بۆ لای خۆی رای کێشا، کابرای میسریش دەیویست بەری نەدا لە ئەنجامی راکێشانی هەردووکیاندا نێزەکە بوو بە دوو کەرتەوە، کابرا کە زانی نێزەکەی وای لێ هات شمشێرەکەی لە زەدیج هەڵکێشا، زەدیجیش شمشێرەکەی خۆی هەڵکێشا، کابرای میسری بە گۆترە شمشێرەکەی ئاراستە دەکرد، دوژمنەکەشی بە ئاسانی و کارامەیی خۆی لادەدا، ئافرەتەکەش لەو لاوە لەسەر سەوزە گیایەك دانیشت سەر و زلفی خۆی تیفە تیفە دەدا، کابرای میسری گەلێ ناقولا و بەهێز بوو، بەلام زەدیج گەلێ لەو شارەزای مویارەزە بوو، ئەمیان بە دەستێکی شیری دەوەشاند و بەویتریان پارێزگاری لە خۆی دەکرد، دووەمیش وەکو بەراز هەر ملی دەنا، تووڕە بوونەکەی هونەری مویارەزەی لێ تێکدابوو، زەدیج کە زانی کابرا بە ملهوری خۆی دەنازێ و وازی لێ ناهێنێ، بە زەویادا و چەکی کرد و نوکی شیرەکەی خستە سەر سنگی و حەزی نەکرد بیکوژێ.

میسرییەکە لە ژێرەوە بە نووکی خەنجەرەکەی زەدیجی بریندارکرد، کەچی ئەو لێی بووری بوو، زەدیج کە زانی ئەو کابرایە سەر سەختە و وازی لێ ناهێنێ و خراپ برینداری کردووە، شیرەکەی لە سنگی کابرا چەقاند، کابرا یەك نرکەی لێ بەرز بووە و گیانی دەرچوو، زەدیج لەسەرخۆ چوو بۆ لای ژنەکە و بە ئاستەم پێی وت: (ناچاری کردم کە بیکوژم، ئێستا تۆ بۆ کوێ دەڕۆی سەربەستی، لە ئازار و ئەشکەنجەی ئەو کابرایە رزگاربووی، لەوەتەی دەژیم پیاوی وەکو ئەو کابرایە ملهوڕ و تووڕەم نەدیووە، ئەوجا چیت لەمن دەوێ بڵێ).

ژنەکە وتی: (دەمەوێت بمری! چونکە خۆشەویستەکەمت کوشت، ئەگەر پێم بکرایە دڵتم دەردەهێنا پارچە پارچەم دەکرد!)

زەدیج: (خانم بەڕاستی میزاجێکی سەیرت هەیە، ئەو کابرایە ئەوەندە بێبەزەییانە لێی دەدایت لە مردن نزیکی دەکردیتەوە، مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی بمکوژێ، من گوناحم نەبوو، تۆ پەنات بۆ من هێنا، منیش بەدەم هاوارتەوە هاتم).

ژنەکە قیژاندی و وتی: (بریا تا دەمردم لێی دەدام، مافی ئەو لێدانەم هەبوو، من غیرەتم لێ نابوو، وا تووڕەبێ، خۆزگا تۆ لەشوین ئەودا لەخوێن دەگەوزایت). زەدیج پێی وت: (خانم تۆ سەیریت، من ژنی وەك تۆم نەدیووە، ئەگەر لەبەرئەو جوانییەت نەبوایە وەکو ئەو کابرا لێم دەدایت، بەڵآم خۆم بە لێدانت ماندوو ناکەم).

زەدیج پشتی لە ژنەکە کرد و سواری وشترەکەی بوو، بەرەو ئاواییەکە رووی نا، ئەوەندە دوور نەکەوتبووەوە، غەڵبە غەڵبێك لە دوایەوە پەیدا بوو، کە ئاوری دایەوە چوار پیاو بوون بە گوڕ دەهاتن، ئەوەی پێشەوە کە چاوی بە ژنەکە کەوت هاواری کرد: ((ئەمەیە لێرەیە، گرتوومانە، خۆیەتی هەڕاکەن تادەرنەچووە بیگرن)) چوار پیاوەکە دەوری ژنەکەیان دا و رفاندیان، کەچی ئاوڕیان بە لای پیاوە کوژراوەکە نەدایەوە، ئافرەتەکە قیژاندی و هاواری بۆ زەدیج دەبرد: ((ئەمجارەش فریام کەوە، لەدەست ئەمانە رزگارم کە.. مەرج بێ ئەگەر ئەمجارەش رزگارم بکەی، ئاڵقەی کەنیزەکیت لە گوێ بکەم.. زۆر پەشیمانم لەو وتانەی کە وتم.. دەسم دامێنتم ئەگەر رزگارم بکەی دەبمە هی تۆ، دەبم بە کارەکەرت)).

بەلاّم زەدیج ئاوری لیّ نەدایەوە، لەبەر خۆیدا دەیووت: ((کۆمەکی مرۆڤی بەد خو ناکەم، جـارێکی دی مـن بـە هـات و هـاواری یـەکێکی وەك تـۆ هەڵناخەڵـەتێم)). جلەکانی زەدیج بە نووکە شیر و خەنجەر شڕ و وڕببوون، هەموو قاچ و قۆڵی پڕلە پەڵە خوێن بوون، پێویستی بە یارمەتی بوو، برینەکانی خوێنیـان لیّ دەچـۆڕا، بەتایبـەتی هاتنی ئەو چوار پیاوە بابلییە کە ئەو ژنەیان رفاند لەوە دەچوو پیاوی شا (مۆیـەدار) بن زەدیج خۆی گەیاندە ئاواییەکـە، لـەتاو ئـازاری خۆیـدا بـیری لـە چـوار پیاوەکـە نەدەکردەوە بۆچی ئەو ژنەیان رفاند، سەری لە رەفتاری ئەو ژنەش سوڕمابوو، بۆچـی وابوو!

* * *

## کۆیله

زەدیج لەمە گەیشتە کەنار ئاواییەکە خەڵکەکە لێی خڕ بوونەوە و هاواریان دەکرد ئەمەبوو (مەیسووف)ی رفاند و (کلیتۆفیس)ی کوشت، زەدیج سەری سوڕما، هەر ئەوەندەی پێکرا، رووی کردە خەڵکەکە و وتی: (گەورە و بەڕێزەکان.. داوام لە خوای گەورە ئەوەیە تووشی کوشتنی کەسم نەکات، من چۆن جوانەی ئێوە دەرفێنم، بەڕاستی ئەو ژنە گەلێ لە خۆیایی بوو، کوشتنی (کلیتۆفیس)یش خەتای منی تیا نەبوو، من تەنیا بەرەنگاریم لە ژیانی خۆم کردووە، ئەو لەسەر کوشتنی من مکوڕ بوو، لەپێشەوە تکام لێ کرد کەم لەو ژنە بدا، لە جیاتی ئەوەی بەزەیی پیادا بێتەوە خراپتر لێی دەدا، کەوتمە بەینیانەوە هەستم کرد دەیەوێ بمکوژێ، من کەسێکی ئاوارەم پەنام بۆ لای ئێوە هێناوە، بە عەقڵی کێدا دەچێ یەکێك پەنا بەرێتە بە خەڵکانێك کەچی ژنیان بڕفێنێ و پیاویان بکوژێ)).

لەو سەردەمەدا میسرییەکان گەلێ دادپەروەر و خانەدان بوون، پێش ئەوەی رەوانەی دادگای بکەن برینەکانیان تیمارکرد و حەواندیانەوە، ئەوجا درایە دادگا، زەدیج و نۆکەرەکەی هەریەك بە جیا لە بەردەم دادوەرەکاندا راوەستان و لەبارەی ئەو رووداوەوە پرسیاریان لێ کرا، دەرکەوت زەدیج بە ئەنقەست ئەو پیاوەی نەکوشتووە، بەڵام خوێنی زەلامێکی رشتووە. حوکمی قانوون ئەوەبوو ((کۆیلەکردنی زەدیج و نۆکەرەکەی و فرۆشتنی هەردوو وشترەکەی، نرخەکەیان و ئەو زێڕ و زیوەش کە پێیان بوو هەمووی بە یەکسانی بەسەر ئەهلی ئاواییەکەدا دابەشبکرێ و خۆی و نۆکەرەکەشی لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا هەراجبکرێن)). لەمە لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا هەراجکران، بازرگانەکان لە هەموو لایەکەوە خرۆشان و بازاڕ گەرم بوو، نرخیان گەلێ بەرز بووەوە، هەڕاج لەسەر بازرگانێکی عەرەب کەناوی (سیتۆك) بوو راوەستا نرخێکی چاکی پێدان، بە تایبەتی نۆکەرەکەی لەبەرئەوە بوو ئەو شان وەمل

توند و داکوتراوبوو، توانای کارکردن و بەرگەی تەنگانە و ئێش و ئازاری لە خاوەنەکەی پتر بوو. لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا هێز و پایەداری پارە ناکات، بەو پێوەرە زەدیج وەك بەندەی ژێردەستی نۆکەرەکەی لێ هات و دوای ئەوەی هەردووکیان فرۆشرابوون و نرخیان درا، دەست و پێی هەردووکیان بە یەکەو بەستران و بەرەو ماڵی خاوەنەکەنیان لالە (سیتۆك) بران.

لەڕێدا زەدیج دڵی خزمەتکارەکەی دەدایەوە و مۆژیاری دەکرد کە سەبری هەبێ و بەو نەهامەتییەی بەسەریاندا هاتووە دڵتەنگ نەبێ، لە دڵیشیدا بیری لە ژیانی مرۆڤ و چارەنووسی دەکردەوە، بە خزمەتکارەکەی دەووت: ((مەخابن ئەو نەهامەتییانە کە بەسەرمندا هاتن تۆشیان گرتەوە، چەرخی رۆژگار تا ئێستا بەگەڵێ جۆر بەسەر دانەی ژیانمدا سووڕاوە و گەمەی کردووە)). جارێ تاوانە -- غەرامە — یان لێ سەندم چونکە سۆراخی رەوتی سەگێکم دەکرد. جارێ خەریك بوو ملم بە پەتدا بکرێ چونکە ناوی عەنقام بردبوو، جارێکی دی خرامە بەندیخانە چونکە دوو بەیتە شیعری چاکەم سەبارەت بە شا نووسیبوون. جارێکی تر فەرمانی خنکاندنم درا چونکە قەیتانەکانی شاژن زەرد بوون. وا ئێستاش وەکو کۆیلەیەك فرۆشراوم چونکە بەهانای ژنێکەوە چووم دەکوژرا.

کەوابوو با دان بە خۆماندا بگرین و ملی بۆ شووڕکەین، لەوانەیە ئەم بارەش کە تێی کەوتووین ئەوەندە درێژە نەکێشێ، با نازایەتی وەبەر خۆمان نێن، لەوانەیە ئەو بازرگانە عەرەبە کۆیلەی تری هەبن ئەی بۆ منیش نەبمە یەکێك لەو کۆیلانە، ئەی ئەوانیش وەك ئێمە پیاو نین؟ بڕواناکەم ئەو بازرگانە زەلامێکی دڵڕەق بێ، یەکێ بیەوێ سوود لە کۆیلەی خۆی وەربگرێ دەبێ چاکەیان لە تەکدا بکات: وای بە خزمەتکارەکەی دەووت، کەچی ناخی بە چارەنووسی (ئەستارتیە)وە خەریك بوو.

دوو رۆژی نەبرد بازرگانە عەرەبەکە (سیتۆك) لەگەڵ دوو بەندەکەی و وشترەکانیدا بەرەو سارای وڵاتی عەرەب کەوتە رێ، چونکە ئەو سەر بەو عەشیرەتە بوو لە عەرەبستانی نزیك سارای (ئۆریب) نیشتەجێ بوون، چوون بۆ ئەوێ رێی هات و

نەهات بوو، کابرای بازرگان لەڕێدا بە چاوێکی گەورە تەماشای خزمەتکارەکەی دەکرد تا زەدیج، چونکە ئەو لە تەنگدان و پێچانەوەی کۆچ و باردا لە زەدیج توندتر و شارەزا و گرج وگۆڵ تر بوو، بۆیە بایەخی بەو دەدا، بە شەو و ڕۆژ دەشتی عەرەبستانیان دەبڕی و بەرەو ئۆریب دەڕۆیشتن، ماوەی شەو و ڕۆژێکیان مابوو بگەنە بەرەوە یەکێك لە وشترەکان مردار بووەوە، باری ئەو وشترەی بەسەر بەندەکاندا دابەشکرا، زەدیجیش بەشی خۆی دا بەکۆڵ خۆیدا. کابرای بازرگان کە سەیری بەندەکانی خۆی دەکرد، لەژێر کۆڵە قورسەکانیاندا چەماونەتەوە و چەناگەیان نیشتووەتە سەر ئەژنۆیان، لەخۆشیدا دەکەوتە پێکەنین.

زەدیج خۆی لێ نزیك کردەوە بۆ ئەوەی هۆی چەمانەوەی ئەو بەندە کۆڵ هەڵگرانەی بۆ ڕاڤە بکات، کە لە قانوونی (هاوسەنگی) حاڵی کرد، سیتۆك سەرسام ما، لەوساوە بە چاوێکی تر تەماشای دەکرد، کە زەدیج زانی ئەو کابرایە ئارەزووی فێربوونی تیایە، ئەوەندەی تر لێی نزیك بووە و گەلێ شتی فێرکرد کە پەیوەندییان بە بازرگانییەوە هەبوو، فێری جۆری قورسایی ئەو شتانەی کرد کەلە کەرەسەدا جیان و قەبارەیان یەکە. هەروەها لە هەندێ تایبەتییەکانی ئاژەڵانی تێگەیاند کە چۆن مرۆڤ پێی دەکرێ سوودیان لێ وەربگرێ، لەوەوە بازرگانەکە بۆی دەرکەوت ئەو بەندەیەی فەیلەسووفە. وای لێ هات (سیتۆك) ڕای خۆی گۆڕی، زەدیجی لا پەسندتر بوو تا خزمەتکارەکەی، بەچاوێکی تر مامەڵەی لەتەکدا دەکرد، گەلێ لەدڵی خۆیدا لە خۆی ڕازی بوو کە لەوەوبەر جگە لە چاکە خراپەی لەگەڵدا نەکردبوو. تازە نزیکی دەڤەری (ئۆریب) ببوونەوە، سیتۆك چووە لای ئەو پیاوە جووە کە بە ئامادەبوونی دوو دێوەر (١) پێنج سەد میسقاڵ زێری بە قەرز پێدابوو، بەڵام دوو دێوەرەکە مردبوون، کابرای جووە هەلی بۆ ڕێکەوتبوو، سوپاسی خوای کردبوو کە ئەو دوو دێوەرە مردبوون، ئیدی کابرای عەرەب ناتوانێ قەرزەکەی لەسەر ئیسپات بکات.

زەدیج ببوو بە راوێژکاری سیتۆك و لەزۆر شتدا پرسی پێ دەکرد، چیرۆکی قەرز دانەکەی بەو کابرا جووە بۆ گێرایەوە کە چۆن لێی قەرز کردووە و وا ئێستا نایداتەوە.
زەدیج وتی: (گەورەم لە کوێ ئەو زێرانەی لێ خواستی).
سیتۆك: (لەسەر تاشە بەردێکی گەورە میسقاڵ بە میسقاڵ بۆم ژماردووە و لەدەستم کردووە، تاشە بەردەکە نزیك شاخی ئۆریبە).
زەدیج: (ئەو پیاوە جووە بە چییەوە ناسراوە).
سیتۆك: (پیاوێکی لار و پارە خۆرە).
زەدیج: (ئەوەی بیزانی ئەو پیاوە زیرەکە، گێلە، چییە، وریایە، یان کەم تەرخەمە).
سیتۆك: ((نە زۆر زیرەکە نە زۆر گێل، مام ناوەندییە)).
زەدیج: ((دەخوازی من ببم بە پارێزەرت، لە باتیت داوای مافەکەت لە دادگادا بکەم)).
سیتۆك: ((زۆرم پێ خۆشە)).
زەدیج: دوای ئەوەی بەڵێنی پارێزەری لە سیتۆك وەرگرت، سکاڵای دژی کابرای جووە گەیاندە دادگا، بەو تۆمەتەی کە ئەو بڕە زێرانەی بە قەرز وەرگرتووە و وا ئێستا نوکڵی لی دەکات، کابرا هێنرایە بەر دادگا و لە ناو رەتی[٢] گوناحباراندا راگیرا.
کە دادگا کرایەوە، زەدیج رووی کردە دادوەرەکان و وتی: (ئەی دادوەرە مەزنەکان، ئەی پارێزەرانی مافی هەژاران، ئەو پیاوە کە لەناو رەتی گوناحباراندا راوەستاوە، پێنج سەد میسقاڵ زێری خاوەنی منی بە قەرز وەرگرتووە، وا ئێستا نایداتەوە، وا من لەبەر دەستی بەرێزتاندا بەناوی خاوەنەکەیەوە داوای ئەو بڕە زێرانەی لێ دەکەم.
سەرۆکی دادوەرەکان رووی کردە زەدیج و وتی: ((تۆ شاهیدت هەیە کە ئەو پیاوە ئەوەندە زێری لە خاوەنەکەت قەرزکردووە؟))

---

٣- (١) دێودر - شاهید.
(٢) رەت — قەفەس

زەدیج وتی: ((بەڵێ دوو شاهید لـە بەینیـدا بـوون بـەڵام هـەردووکیان مـردوون، ئەوەندە هەیە ئەو زێڕانەی کە پێیدراوە یەك بەیەك لەسەر تاشە بـەردێکی پـان بـۆی ژمێردراون، ئەو تاشە بەردە شاهێدی دەدات، ئەگـەر بـەڕێزتان فـەرمان بفـەرموون، چەند زەڵامێك لەسەر ئەرکی خاوەنەکەم دەنێـرم بیهێننـە ئێـرە، بۆئـەوەی شـاهیدی بدات، دادوەرەکان رازی بوون بە دۆزی ترەوە خـەریك بـن تـا بەردەکـە دەگـات، لـە دواکاتی دادگادا سەرۆك دادگا رووی لە زەدیج کرد و وتی:

(ئەوە بۆ بەردەکە نەهات)

کابرای جووە دایە قاقای پێکەنین و وتی: ((ئایا بەڕێزتان تـا بـەیانی چـاوەڕوانی ئەو بەردە دەکەن؟ ئەو بەردە چۆن دێتە ئێرە، شەش میل لێـرەوە دوورە و کـەمتر لـە پانزە زەڵام ئەوجا بتوانن لە شوێن خۆی هەڵی کەنن)). کە کابرا ئـەوەی وت: زەدیـج هاواری کردو و وتی: بەڕێزان ئەمووت بەردەکە شاهێدی دەدات، ئەگەر ئـەو کابرایـە ئەو قەرزەی لەسەر ئەو بەردە وەرنەگرتبێ چۆن دەزانێ چەند لێرەوە دوورە و قـەبارەی چەند زلە، کەوابێ دانی بەوەدانا کە ئەو بڕە زێڕانە قەرزدارە)). جووەکە دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو و هیچی پێ نەووترا، لەدواییدا ناچاربوو مل بۆ قەرزەکـە شـۆڕ بکـات ئەوجا دادگا فەرمانی دەرکرد کە قەرزەکـە بداتـەوە، خـەرجی ئـەو رۆژەی دادگـاش بکێشێ، لەو رۆژەوە ئەو بەندە — زەدیج — لەناو عەرەبدا ناوداربوو، ئەو بەردەش بوو بە شوێن متمانە و مەزاری هەموو خەڵکی عەرەبستان.

## خۆ سووتاندن

سیتۆك بەوە دڵشاد بوو کە ئەو بەندەیەی جێی متمانە و ڕەزامەندییە، بۆیە وەك هەڤاڵێکی خۆی تەماشای دەکرد، وای لێ هاتبوو بێ زەدیج کاری پێ نەکرێ، وەك شا (مۆبەدار)ی لێ هاتبوو، وای دەزانی نەمانی زەدیج نەمانی دەوڵەتی بابلە، بەلاّم زەدیج خۆی بە بەختەوەر دەزانی چونکە سیتۆك وەك شا مۆبەدار ژنی نەبوو، بەوە شادومان بوو کە سیتۆك خێرخواز و دڵپاك و ڕاستگۆ و خۆش ڕەفتار بوو، بەلاّم بەوەی دلگران بوو وەکو خەلکی ئەو سەردەمە بەندەگی بۆ خۆر و مانگ و ئەستێرەکان دەکرد، گەلێ جار لەو بارەوە بەترێسەوە سیتۆکی دەدواند، لە دواییدا پێی وت: ((ئەو ئەستێرە و مانگ و ڕۆژە، وەکو هەر شتێکی دیکەی ئەم سەرزەوییە وەهانە و تەنن، هیچیان لە بەردێك، لە درەختێکی ئەم سەرزەوییە جیاواز نین)) سیتۆك وتی: ((چۆن جیاوازییان نییە، ئەوانە بوونەوەری نەمرن، ئەگەر ئەوان نەبن سوود لە ژیان نابینرێ، ئەوان گیان بە بەر سروشتدا دەکەن، چوار وەرزی ساڵ ئەوان دروستی دەکەن، جگە لەوەش ئەوان بە ئاسمانەوەن دەستمان نایانگاتێ بۆیە بەلامانەوە گەورە و پیرۆزن.

زەدیج وتی: ((کەوابێ دەریای سوور لە هەموو شتێ زیاتر مافی بەندەگی بەسەرتەوە هەیە، چونکە ئەو لە ئاڵوگۆڕی شتمەکی بازرگانیدا پتر یارمەتیت دەدات بە هۆی ئەوەوە ئاوردە و بردەی بازرگانی بۆ ولاّتی هیند دەکەی، کێ ناڵێ ئەویش وەکو لەشکری ئاسمان نەمرِ نییە، ئەگەر دووریش هۆی پرسین بێ دەبوو دورگەی (چەنجارید) لە هەموو شتێ شایستەی بەندەگی بێ چونکە دەکەوێتە ئەو پەری جیهانەوە)).

سیتۆك وتی: ((هۆی پرسینیان شەوق و تریفە و درەوشانەوەیانە)) زەدیج بێ دەنگ بوو، کە ئێوارە داهات لەناو خێوەتەکەدا کۆمەڵێ چرای بەدەور خوانەکەی

سیتۆکدا ریزکردن که دونیا تاریك بوو، هەڵی گرسانن، که سیتۆك هاتـە ژوورەوە دی زەدیج بەرانبەر ئەو چرایانە بە چۆکدا هاتووە و نزا دەکات: ((ئەی چـرا گـڕدار و پـڕ شەوق و نەمرەکان، ئانومێدم مەکەن و یارمەتیم بدەن))، که سیتۆك زەدیجی بەو جۆرە دی، سەری سوڕما و پیّ وت: ((ئەوە چیت لیّ قەوماوە ؟)) زەدیـج وتـی: ((گـەورەم وەك تۆ دەکەم بەندەگی خۆم بۆ ئەو چرا پڕشەوق و نەمرانە دەردەبڕم، وازم لە خاوەنیان و خاوەنی خۆم دێنم، ئەوان دەپەرستم).

سیتۆك لێوی خۆی گەستەوە و لەو ئاماژەیەی زەدیج دای حـاڵی بـوو، لەناخـەوە کاری تێکرد، ئیدی لەو ساوە وازی لە پرسینی ئەو شتانە هێنا و رووی کـردە ئـەوەی کە ئافەریدەی کردوون. لەو سـەردەمەدا نـەریتێکی نالـەبارِ لـە ولاّتـی سـتیەکانەوە گەیشتبووە ولاّتی عـەرەبان، لەبنەڕەتـدا نەریتەکـە هـی براهمـە هیندییـەکان بـوو، نەریتەکە ئەوە بوو هەرژنێك کە پیاوەکەی دەمرد، بۆئەوەی ئـەو بێـوە ژنـە ببـیّ بـە پاکیزە (١) دەبوو لەسەر گۆڕی مێردەکەی بەبەرچاوی خەڵکەوە خۆی بسووتێنیّ، خـۆ سـووتانەکە لـە ئاهەنگێکـدا دەبـوو، بـەو ئاهەنگـە دەووتـرا (ئاهـەنگی سـووتانی بێوەژنان). ئەو هۆزەی ناوی بە چاکە و رابوردەی چاکی هەبوایە ئـەو هـۆزە بـوو کـە ژمارەی بێوەژنی سووتاوی زۆر بوایە، رێکەوت وابوو لەو کاتەدا یەکێك لە پیاوەکانی هۆزی سیتۆك مردبوو، ژنێکی جوانی لەدوا بەجیّ مابوو، بریار وابوو ئەو ژنە ئاهەنگ بۆ خۆ سووتاندنی رێك بخرێت و لەدوای مێردەکەی خـۆی بـسووتێنیّ، خـۆی بـۆ ئـەو ئاهەنگە ئامادە کردبوو، هەموو دهۆڵ کوت و زرنا ژەنـەکانی تێگەیانـدبوو، ژنەکـە ناوی (ئەلە مۆنا) بوو خۆی بە ژنێکی رەوشت پاك و چاك دەزانی، هەواڵی رۆژی خـۆ سووتانەکە گەیشتە لای زەدیج، دەست بەجیّ بە سیتۆکی وت: (ئەو نەریتە خـووێکی قێزەون و ناڵەبارە، لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ناگونجێت، ئـەو ئافرەتـە کـە ئـەو خـووە دەیانکات بە خۆڵەمێش، ئەگەرخۆیان نەسووتێنن دەبنە مایـەی شـانازی میللـەت و دەتوانن ببن بە دایك و چەندین رۆڵەی نویّ بۆ دوارۆژ بێننە ئاراوە، هەرهیچ نەبیّ کـە

خۆیان نەسووتێنن دەتوانن رۆڵەکانیان گەورە بکەن)، زەدیج وازی نەهێنا تا سیتۆکی لەوە دڵنیا کرد کە وازهێنان لەو نەریتە بەدفەرە چاکەیەکە نموونەی نییە.

سیتۆك وتی: ((ئەوە پێنج سەد هەزار ساڵە ئەو نەریتە هەیە و بێوەژنـان لـەدوای مێردەکانیان خۆیان دەسووتێنن، کەس دەنگی نەکردووە، خووێك ئەوەندە ساڵ هـاتبێ و رۆژگار با ستەمیش بێ ئەو هەموو دیرۆکەی هەبێ حەقی رێزلێنانی هەیە لە یـاری کەسدا نییە بیگۆڕی)).

زەدیج وتی: ((ژیری مرۆڤ گەلێ لەو نەریتە کۆنترە)).

دیاربوو سیتۆك بڕوای بە گۆڕینی ئەو نەریتە هاتبوو بۆیە زەدیج پێی وت: (تۆ بڕۆ پیاوە ریش سپییەکانی هۆزەکەت تێ بگەیێنە وا منیش دەچم بۆ لای ئـەو بێـوە ژنـە گەنجە. زەدیج بە شێوەیەکی نەرم و نیان ژنەکەی دواند، کـە بـە وتـەکانی هۆگربـوو ماتییەك دایگرت، زەدیج کەوتە مەراییکردنی، تا بە تەواوی زانی ژنەکـە لـە کـەلی شەیتان هاتۆوتە خوارەوە، هەندێ لاوانییەوە، ئەوجا پێی وت: حەیفە ئەو دیمەنە جوانە کە وەك مانگ تریفەدارە، وەك ئەستێرەی گەلاوێژ دەدرەوشێتەوە بسووتێ و ببێ بـە خۆراکی ئاگر، گەورەترین ستەم ئەوەیە گوڵێکی وەك تۆ ببێ بـە خۆڵـەمیش و بـدرێ بەدەم باوە، هەندێکی تر هەڵێنا و وتی: ناو چاوانت نیشانەی نەترسی و نازایەتی پێوە دیارە، ئەوجا پێی وت) وادیارە تۆ مێردەکەی خۆت گەلێ خـۆش ویـستووە). ژنەکـە وتی: (من؟..نا..) یەك تۆزم خۆش نەدەویست، چەند بلێ پیاوێکی چەتوون و نەگریس بوو، کەس نەبوو بەرگەی رەفتارەکانی بگرێ، لەگەڵ ئەوەش موکرم کـە لـەپاش ئـەو خۆم بسووتێنم)، زەدیج وتی: (دیارە خۆسووتان چێژێکی خۆش بە مـرۆڤ دەبەخـشێ). (ئەلەمۆنا) وتی: جا لە خۆ سووتان سەختتر هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ناچارم، من ژنێکی پاك و بە ناموسم، نابێ بە خۆ نە سووتان ناوی خۆم خراپ بکەم، یان خۆم بکـەم بـە گاڵتەجاری خەڵك)، زەدیج وتی:

(بە وتەکاندا دەردەکەوێ لەبەر خەڵك خۆت دەسووتێنی، دیارە فیـز و هـەوا دەت خەنە سەر ئەو رێگەیە). بەو چەشنە وردە وردە خۆشی ژیـانی خـستەوە نـاو هۆشـی

ژنەکە، ئەوجا پێی وت: ئەگەر لەو فیز و هەوایە کە بەرەو سووتان رات دەکێشن رزگاربووی چی دەکەی ؟).

ئەلەمۆنا وتی: (بەداخەوە دەیڵێم: ئەگەر لەو فیز و هەوایە رزگاربووم داوات لێ دەکەم بمکەی بە هاوسەری خۆت).

زەدیج لە ناو خۆشەویستی ئەستارتیەدا تواببووەوە، بۆیە پێی پەسەند نەبوو بە گاڵتەش بێ درۆ لەگەڵ دڵیدا بکات. دوای ئەوەی ئەلەمۆنای لە خۆ سووتان سارد کردەوە، چوو بۆ لای پیاو ماقووڵانی هۆزەکە داوای لێ کردن کە قانوونێك دابنێن، هەر ژنێك مێردەکەی مرد بەر لەوەی خۆی بۆ سووتاندن رێك بخات، ساتێك بۆ گەنجێکی جوان بچێتە پەردەوە، ئیدی لەو رۆژەوە هیچ بێوەژنێکی مێرد مردە لەو وڵاتەدا خۆی نەسووتاند، لەو کاتەوە وڵاتی عەرەبان ملکەچی ئەو چاکە گەورەیەی زەدیج بوون کە توانی لە رۆژێکدا نەریتێکی بەدفەڕ کە هەزاران ساڵ بوو چنگی لە خوێنی ئافرەتان گیرکردبوو لابات، هەرلەوساوە ناوی زەدیج بوو بەسەر دەفتەری پیاو چاکانی عەرەبستان.

❊ ❊ ❊

## خوانی شێوان

لەبەر ئەوەی زەدیج کەسێکی حەکیم و زانابوو، سیتۆك بێ ئەو کاری نەدەکرد، لەکارە بازرگانییەکانیدا ئەو رابەر و راوێژکاری بوو، لەیەکێ لە کاروانە بازرگانییەکانیدا بەرەو بازاڕی بەسرە چوو، لەو سەردەمە پێگەی بازرگانی و کاروان سەرای بازرگانان بوو، هەموو بازرگانەکانی دونیا لەوێ یەکتریان دەناسی، زەدیج گەلێ شادمان بوو بەوەی کە لەو شارەدا شوناسی لەگەڵ مەردوومی ولاتانی هەمەجۆرەدا پەیدا دەکات، ئەو لەبەر خۆیەوە مرۆڤی هەموو جیهانی بە ئەندامی یەك خێزان دەزانی، پتر شادمانییەکەی لەوەدا بوو لە ماوەی ئەو دوو رۆژەدا کە لەوێ دەمانەوە دەرفەتی ئەوەی هەبوو گەلێ چین و توێژاڵی میللەتانی جۆراوجۆر لە نزیکەوە ببینێ، هەر بەو دیتنەش نەهامەتی و دەردەسەرییەکانی خۆی لە بیر دەکات. کە گەیشتە بەسرە دی ئەوەندە بازرگانی تیا کۆبوونەتەوە قۆڵی دەدا، لەبەر ئەوەی بازرگانەکان گەلێ جار رێیان کەوتبووە ئەو شارە هەریەك کەمێ فێری زمانەکەی ببوون.

لەرۆژی دووەمدا لەسەر خوانی نان خواردنی شێوان لەتەك کۆمەڵە بازرگانێك دانیشت، لەناویاندا میسری، هیندی جنجارید، یۆنانی، کلدانی، کتایی و هی تریش هەبوون، کابرای میسری تووڕە دیاربوو، لەبەر خۆیەوە دەیووت: (ئەوەی هەم لە خەڵکی ئەم بەسرەیەم نەزان و خراپتر نەدیووە، لەم هەموو بەسرەدا گەڕام یەکێکم دەست نەکەوت هەزار میسقاڵ زێڕم بداتێ لە جیاتیدا بە نرخترین بارمتەی بدەمێ).

سیتۆك رووی تێکرد و وتی: (شتی وا نابێ؟ ئەو پارچە نەختینە نایابە چییە کە دەیکەی بە بارمتەی ئەو قەرزە ؟) میسرییەکە وتی: (لاشەی پوورمە ئەو پوورە کە لە ناو ژنانی میسردا شای ژنان بوو، لە چاکی و داوێن پاکیدا نموونەی نەبوو، بۆ هەر ولاتێ برۆشتمایە لە تەکمدا دەهات، لەم سەفەرەمدا مەرگ بەرکی گرت و مرد،

جەستەکەیم بە جۆرێك مۆمیاوی کردووە لـە میسریـشدا نـاکرێ، ئەگـەر لـە وڵاتـی خۆمدا بە بارمتە بیدەم چەندم گەرەك بێ دەمدەنێ، چەند شتێکی سەیرە ئەو خەڵکـە لێیان نەوەشایەوە بەهەزار میسقاڵ ئەو نەختینە پڕ بەهایەم لێ وەربگرن). لەکاتی ئەو قسانەدا لاقە مریشکێکی کولاوی دایە بە قەپاڵ و دەی پچران، بازرگانە هیندییەکـە مەچی گرت و هاواری کرد: (ئەوە چی دەکەی؟!). خاوەن مۆمیاکە وتی: (چـۆن چـی دەکەم؟ دەمەوێ ئەو لاقە مریشکە بخۆم).

هیندییەکە وتی: (نەکەی، نیشی وانە نەکەی، چۆن دڵت دێ گۆشـتی پوورەکـەت بخۆی، لەوانەیە گیانی پوورەکەت بەبەر ئەو مریـشکەدا کرابـێ چـۆن دەبـێ گۆشـتی خۆشەویستی خۆت بخۆیت نەوەی ئەو مریـشکەی کولانـد، سـووکایەتی بـە سروشـت کردووە). میسرییەکە سەرسام ما و وتی: (تێناگەم ئەوە چی دەڵێی، مریشکی چـی و سروشتی چی، ئێمەی میسری گا و گوێلك دەپەرسـتین و گۆشتەکەشـیان بـە ئاسـانی دەخۆین. کابرای هیندی وتی: (چـما ئێـوە گـا دەپەرسـتن ؟). میـسرییەکە وەلامـی دایەوە: (بۆ گا پەرستینت بەلاوە سەیرە؟ ئێمە لەسەر گا پەرستین دەژین، ئـەوە سـەد هەزار و پێنج سەدوسی ساڵە گا دەپەرستین بەبێ ئەوەی یەکێ لە ئێمـە نـارەزایی لێ دەربڕێ) کابرای هینـدی وتـی: (سـەد هـەزار و پێـنج سـەد و سـی سـاڵ !؟) ئـەوە زیادەڕۆییە لە ئەژماردا، ئێمە گەلێ لە ئێوە کۆنترین کەچی هەشتا هەزار سـاڵ نـابێ نیشتەجێی وڵاتی هیندین، گومان لەوەدا نییە ئێمە گەلێ لە ئێوە کۆنترین، بەرلەوەی ئێـوە گـا سـەر بـبڕن لەسـەر ئـاگر بیـبرژێنن براهمـا گۆشـتەکەی لەسـەر ئێمـە حەرامکردووە). میسرییەکە وتی: (پێکەنینم دێ، ئەوە تۆ خۆت گێـڵ دەکـەی نـاوی براهما دێنیتە ڕیزی ناوی (ئابیس)، چما براهمـا چ مۆدزەیـەك[٤] یـان ئاسـەوارێکی سەیری لەدوا بەجێماوە؟! کابرای هیندی چاوی پەرینـە تـەوقی سـەری و ڕووی کـردە میسرییەکە و وتی: (ئەوە تۆ لەکوێ خەوتووی! ئەی براهما نەبوو هەموو گێتی فێری

---

٤- مۆدزە: معجزە

خوێندن و نووسین کرد، هەموو ئادەمیزاد قەرزاری ئەوە، ئەی ئەو نەبوو خەڵکی ئـەم سەرزەمینەی فێری شەترنج کردن).

کابرای کلدانی کە ئەوەی لە هیندییەکە بیست و پارووەکەی دەسـتی دانـا و وتـی: (ئەوەی تۆ دەیلێی وانییە، ئەو شتانە تەنیا لـە دەسـت (یـونس)ی خـاوەن نەهـەنگ هاتووە، ئەوشتانە ئەو خەڵاتی مرۆڤی کردوون، دەبێ حـەق بدرێتـەوە بـە خـاوەنی و چاکەی لەبیر نەکرێ، هەموو خەڵکی ئەو جیهانـە لـەو بڕوایـەدان کـە نەهەنگەکـەی یونس گیانلەبەرێکی یەزدانی بووە، کلکی زێر و سـەری ئادەمیزادانـە بـووە، یـونس پێغەمبەر لەناو زکی ژیاوە، هـەموو ڕۆژێ سـێ سـات هاتووەتـە دەرەوە بـۆ ئـەوەی ڕێگەی ڕاست پیشانی مرۆڤ بدات، چەندین منداڵی لێ بوون، لەوانەش پاشـا و پیـاو چاك لە نەوەی ئەون و لەو هەڵکەوتوون، ئەوەی خاوەن چقەو خانەدانە لە نەوەی ئەون، وێنەیەکی لامە بە بـاوەڕ و ئـایینێکی پاکـەوە، دەیپەرسـتم، مـرۆڤ بـۆی هەیـە بـە ئارەزووی خۆی گۆشتی گا بخوات، بەڵام بۆی نییە ماسـی بـبرژێنـێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێوە بە قسەکانتاندا دیـارە تـازە پێگەیـشتوون، کـەوابێ پێویـست ناکـات ئەوەنـدە لەسەری بڕۆن، مەردوومی میسر بەوەوە شانازی دەکەن کە مێـژووی دەگەڕێتـەوە بـۆ سەد هەزار و سەد و سی و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا، کاکی هیندیش بـەوە سـەربەرزە کە دیرۆکیان هەشتا هەزار ساڵە، کەچی ڕۆژژمێری ئێمە چوار هەزار سـەدەی بۆمـان تۆمار کردووە، گوێم لێ بگرن و واز لەو قڕە و بڕە بێنن و کـەم وڕینـە بـە خۆتانـەوە بکەن، حەزدەکەن هەریەك وێنەیەکی حەزرەتی (یونسی) تان دەدەمێ.

لەمە کلدانییەکە لە وتەکانی بووەوە، زەلامێك کە خەڵکی وڵاتی (کەمبالۆ) بـوو هاتە دەم وتی: من میسرییەکان و براهمەکان و کلدانییەکان و یونانی و گای ئاپییس و نەهەنگە گەورەکەی یونس بەڕێزەوە تەماشا دەکـەم بـەڵام لەوانەیـە (ئـەللی) کـە شەوقی هەموو سروشتە پان (گەیان) کە خوا و ئاسمانە لە گـا و نەهـەنگ شایـستەی تری پرسین و بەندەگی بێ، ئەمە جگە لە وڵاتەکەم کە چەندین جار لە وڵاتی میـسر و کلدان و هیند گەورە و بەرینە، خۆم ناهێنمە ڕێز ئێوە، من بـەوە بەختـەوەرم کـە لـە

رەچەڵەکدا لە هەمووتان رەسەنترم، ئەگەر گەورەیی بەرۆژژمێر بێ هەموو وڵاتانی ئاسیا رۆژژمێری ئێمە بەکاردەینن، بەرلەوەی کلدانی فێری ژمارە بوون، ئێمە راسترین رۆژژمێرمان داناوە، کەواتە ئێمە سەر قافڵەی هەموو گەلانین). هێشتا کابرای (کەمبالۆ)یی وتەی تەواو نەکردبوو، کابرای یونانی هاتە دەم و وتی: (ئێوە هەمووتان نەفامن، ئەی نازانن (کاووس) سەرچاوەی هەموو شتێکە، ئەی نەتان زانیوە مادده و وێنە وایان کردووە ئەم گەردوونە وەکو هەیە، ببێ ؟).

کابرای یۆنانی زۆر درێژەی بە وتەکانی دا، کابرایەکی (کلتی) لە کاتی ئەو مشتومڕ و دیالۆگەدا هەرخەریکی خواردنەوە بوو، سەرخۆش بوو وای دەزانی لە هەموویان زاناترە، لەپڕ هاواری لێ هەڵسا و وتی: (ئەوەی پێ ناوێ بەلای منەوە هیچ شتێ وەك گوڵە (توتڕك) و (بەڕو) شایستەی رێز و شکۆمەندی نییە، ئەوەتا من هەمیشە گوڵە تووڕکم پێیە، باو و باپیرانمان کە (ستییەکان)ن، لەسەر هەموو کەسێ پێویستە چاکەی ئەوان لەبیر نەکات چونکە تەنیا ئەوان بوون لەسەر ئەم زەوییە خێرخواز و چاکەکار، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاسایی گۆشتی مرۆڤیان دەخوارد، ئەوەی ناوی (تووڕك) بە خراپە ببات گیرۆدەی دەکات.

بەو جۆرە لە نێوان ئەوانەی لەسەر خوانەکە گلێر بوون تووڕەیی و رەکەبەری تا دەهات توندتر دەبوو، سیتۆك هەستی کرد نزیکە سەرخوانەکە بەخوێن سوور ببێ، لەماوەی ئەو هەموو گفتوگۆیەدا، زەدیج کەناری گرتبوو دەنگی نەکرد، کەزانی هەرکەس قسەی خۆی کرد ئەوجا هەڵسا و رووی کردە کابرای کلتی چونکە لە هەموویان تووڕەتربوو، وتی: (خاڵەی کلتی هەرچیت فەرموو راستە، ئەرێ بڕێ لەو گولانەی کەپێتە نامدەیتێ ؟ هەندێ سوپاسی یونانییەکەی لەسەر رەوانبێژییەکەی کرد و ئاگری توند و تیژییەکەی هەموانی دامرکاندەوە، لەپاشدا رووی کردە هەموویان و وتی: (برادەرە بەرێزەکان خەریك بوو لەسەر هیچ بەگژ یەکتردا بچن. ئەی نازانن هەمووتان لەبیر و رادا یەك دەگرنەوە !؟). رووی کردە کابرای سیتی و پێی وت:

(دەزانم تۆ گوڵ و بەرو دەپەرستی، ئەوەش کە دروستی کردوون دەیپەرستی وایە ؟
سیتییەکە وتی: بەڵێ وایە.

ئەوجا رووی کردە کابرای میسری و وتی: (بەرێز برای میسری تۆ لە گادا ئەوە دەپرسی کە ئەو گایەی دروستکردووە، وایە ؟).

بە کابرای کلدانی وت: ئەوەی یونس و نەهەنگی دروستکردوون دەبێ شاینی بەندەگی بێ، وایە).

پیاوە کلدانییەکە وتی: راستە، من لەسەر ئەو بروایەم.

ئەوجا رووی کردە هیندی و کاتییەکە و وتی: دڵنیام ئێوە هەردووکتان باوەرتان بە سەرەتای بوونی هەموو شتێ هەیە، بەڵام ئەوەی یۆنانییەکە وتی (لەوتە پر مانا و رەوانەکانی تێنەگەیشتم، بەڵام لەوە دلنیام کە بروای بە بوونی توانایەکی گەورە هەیە کە ماددە و وێنەکانی دروستکردوون). یۆنانییەکە بە پەیڤەکانی زەدیج سەرسام بوو، ئەوجا وتی: بە راستی زەدیج لێم تێگەیشت چی دەڵێم، زەدیج وتی: (کەواتە هەمووتان یەك باوەرتان هەیە، ئیدی لە سەرچی دەتانەوێ بەگژی یەکتردا بچن؟).

هەموو لێی خربوونەوە و دەستیان لە ملی کرد. دوای ئەوە سیتۆك گشت شتمەکە بازرگانییەکانی بە قازانجێکی چاك فرۆشت و لەگەڵ زەدیجی برادەریدا گەرایەوە بۆ ناو هۆزەکەی خۆی. لەو ماوەدا کە سیتۆك و زەدیج چووبوون بۆ بەسرە، دەنگی هەڵوەشانەوەی نەرێتە نالەبارەکەی خۆسووتاندنی بێوەژنان لەهەموو لایەك دەنگی دابووەوە و ببوو بە هۆی نانبرینی کاهێنەکان، لەبەر ئەوە هەموو کۆبوونەوە و زەدیجیان بە تاوانبار دانا و بریاریان دا کە گەرایەوە بە ئاگر بیسووتێنن، بەر لەوەی بگاتە بەرەوە زەدیج لە پلانەکەیان ئاگادار کرایەوە.

* * *

# ژوان

هەڵوەشانەوەی نەریتەکەی خۆ سووتانی بێوەژنان ببوو بە هۆی نان بڕینی کاهینەکان، چونکە هەر ژنێ کە خۆی دەسووتاند خشڵ و کۆتەڵەکەی دەدرا بە وان، ئەو کاتەی زەدیج لە بەسرە بوو، کاهێنەکان کۆ دەبنەوە، کۆمەڵە تۆمەتێکیان بۆ زەدیج داتاشی، جگە لەوەی ببووە هۆی نەهێشتنی نەریتی خۆ سووتانەکە گوایا گوێیان لێی بووە وتوویەتی) کەی ئەستێرەکان لەناو دەریادا ئاوادەبن) لە دادگادا کاهێنەکان هەموویان سوێندیان خواردبوو کە بەگوێی خۆیان بیستویانە ئەو کوفرەی کردووە، کە دادوەرەکان گوێیان لەو قسەیە بوو لەشیان کەوتە لەرزین و خەریك بوو یەخەی خۆیان دادڕن، دەیانووت ئەوە چۆن ئاسمان نایەتەوە یەك و بەرد نابارێ، کوفری وا تائێستا نەبیستراوە، ئەگەر سزادانێکی تر جگە لە سووتان بەناگری کز هەبوایە بڕیاریان لەسەر دەدا.

سیتۆك کە ئەو بڕیارەی بیست گەلێ پەرۆش بوو، هەوڵی دا بە هەر نرخێك بووە زەدیجی برادەری رزگار بکات، بەڵام هەرەشەی لێ کرا کە خۆی لەو بابەتە دوور بخاتەوە. (ئەلەمۆنا) کە ئەوەی زانی هەوڵی رزگاربوونیدا، ئەو بە هۆی زەدیجەوە بوو ژیانی بەردەوام بوو، ئەو ئەوی لە سووتان رزگارکرد، دەشێ ئەویش هەوڵ بدا ئەو لە سووتان رزگاری بکات، بیرۆکەی نەخشەیەکی لە مێشکی خۆی دانا و لای کەس نەی دڕکاند چی دەکات، بڕیاری دابوو بەرلەو بەیانییەی کە زەدیجی تیا بسووتێنرێ نەخشەیەك بۆ رزگاربوونی دابنێ، کەواتە لەبەردەم ئەلەمۆنادا تەنیا یەك شەو ماوە، دەبێ نەخشەیەکی فریاد کەوتە بۆ رزگاربوونی دانێ، ئەمە ئەو نەخشەیەبوو کە بە ئەسپایی لەسەرخۆ دەسی کرد بە جێبەجێکردنی، ئێوارەی ئەو شەوە ئەلەمۆنا خۆی شۆشت و گوڵاوی لەخۆی پژاند و جلی جوانی پۆشی و سەر و زلفی تیف تیفە دا و خۆی رازاندەوە، کە لەبەردەم ئاوێنەکەیدا راوەستا وەکو فریشتەیەك خۆی هاتە بەر

چاو، بەلار و لەنجە لەماڵ چووە دەرەوە و رووی کردە چلەخانەکەی سەرۆکی کاهێنانی ئەستێرەکان، کە چووە بەردەمی قۆڵی ماچ کرد و لەبەردەمیدا راوەستا و وتی: (ئەی کوڕە گەورەی ورچی مەزن، ئەی برای گا و کوڕە مامی سەگی گەورە[٥] ) واخۆم خستە ناو ئاسانەکەت، خۆم دەخەمە بن خاکی پات کەلێم ببووری، بۆم دەرکەوتووە گوناحێکی گەورەم کرد کە خۆم بە شوێن مێردەکەمدا نەسووتاند، وا ئێستا هاتووم لە ژێر چاودێری بزرگتاندا لەو گوناحە رزگارم بکەن.

لەو کاتەدا کراسەکەی لەسەر سنگی مەڕمەری خۆی لادایەوە و وتی: (چی لەو لاشە بکەم کە رۆژ بەڕۆژ بەرەو پووچانەوە دەڕوات) بەدەم ئەو پارانەوە وردە وردە کراسە هەورێشمینەکەی لەسەر مەچەکی لادایەوە، تا ماسولکەی دەسی لەناو پەردەی رەشی هەوریشمیدا وەکو کەلەرمی سپی دەرکەوت، موگناتیسی جوانی ئەو مەچەکە سپییە و ئەو سنگە مەڕمەڕییە چاوی پیری کاهینانی وا راکێشابوو لیکاوی مەگیزە چلێسەکانی لە دەمیەوە دەرژاند، ئەوجا پێی وت: ((سەیرکە، ئەم مەچەکە چ نرخێکی ماوە، بەکاری چی دێ). پیری کاهینان وای دەزانی خەون دەبینێ، دەسی بە هەردوو چاوی خۆیدا هێنا، هەدەری لای خۆی نەبوو، نەیدەزانی ئەو چی وتووە و چی بڵێی باشە، هەرنەوەندەی بۆهات وتی: (سوێند بە پیرۆزترین شت ئەوەی هەیە لە خەونیشدا شتی جوانی وەکو ئەو سنگ و مەچەکەی نەبینیوە).

ئەلەمۆنا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و وتی: (خۆ ئەندامەکانی دیکەی لەشم گەلێ لەم نازدارترن بەڵام بەکاری چی دێن، هەموویان بە قوربانی ئەو پەنجە بن یەکسات ساتۆریان بکات) وای دەووت و وردە وردە لە بنەوە پاڵی بە مەمکەکانیەوە دەنا تا لە درزی یەخەی کراسەکەیەوە هاتنە دەرەوە، کەوتنە سەر ئەو سنگە مەرمەرییە کە پێت وابوو سروشت بە تایبەت دروستی کردووە و ئەوە یەکەم جارە پەردەی لەسەر لا دەدرێتەوە، ئەو سنگە مەڕمەڕە، ئەو دوو شەکرە سێوەی باغی ئیرەمە، ئەو لێوە ئاڵە کە ببوون بە شیرازەی جوانترین لولی و مەرجانی ناو دەریای

٥- ئەوانە نازناوی سەرۆکی کاهێنەکان بوون.

سووری ئەو دەمە پاراوە، ئەو برۆ و برژانەگە رەشە، ئـەو چـاوە گەلاوێژییـە هـەموو چەشنی ئاوی حەیات بوون لە ناو زولّماتی تاریکە شەوی زولّف و ئەگریجەدا شەپۆلیان دەدا و دەدرۆشانەوە، هەموو ئەوانە پیری پیرانی لەتەمەنی هەشتا سالّییەوە گێرایەوە بۆ تەمەنی بیست سالّە، دەسەلاّتی لەدەست چوو بوو هەرئەوەندەی پێکرا بلّێ: (خۆشم دەوێی)، ئەلەمۆنا کەدی پیرەی کاهێنان دەسەلاّتی لای خۆی نەماوە و ئـاگری تێبـەر بووە، داوای لێبووردنی زەدیجی لێ کرد، پیری مـەزن وتـی: (تـەنیا لێبـووردنی مـن سوودی نییە، دەبێ سێ لە هاولّە مۆغانەکانی دی لێی ببوورن).

ئەلەمۆنا وتی: (تۆ مۆری لێ خۆشبوونیم بدرێ) پیری مەزن وتی:

(بەسەرچاو بەو مەرجەی لەباتیدا دلّت بدەیتێ) ئەلەمۆنا وتـی: (مـن کەنیزەکی بەردەستم، ئەوە بۆمن مایەی سەربەرزیە، بازوانمان ئەوە بێ کە شەو هـات و ئەستێرەی (شیت) لە ئاسۆدا هەلّهات ئەو دەم وەرە، مـن لـەناو کۆشـکێکی گـولّ رەنگدا دەبینی بەیەك شاد دەبین، ئەو کات چی بە کارەکەری خـۆت دەکـەی بیکـە).

ئەلەمۆنا مۆری لێبووردنی لە پیری کاهێنان وەرگرت. ئەو تیرەی بەدلّ پیرەدا چەقی، هێز و هۆشی لای خۆی نەمابوو، لەوساوە دەسی دایە تیف تیفە کردنی خۆی، پەیتات پەیتا خوێنی سراحی دەکردە ناو کۆچەلّەی خۆمەستکردنەوە، بەتاسەوە دەچووە دەرەوە چاوەروانی هەلّهاتنی ئەستێرەی (شیت)ی دەکرد، وەکو لەسەر ساجێکی سوور دانرابێ وەها ئارامی لێ برابوو، ئەو خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو، خۆی بۆ ئـەو ژوانـە رێـك دەخـست، لەوکاتەدا ئەلـەمۆنا، بەپەلـە خـۆی گەیانـدە لای کـاهینی دووەم، ئـاگری بەردایە ناو جەستەی ئەویش، پێی وت: (خۆر و مانگ و ئەوەی لە ئاسماندایە لە چـاو جوانی تۆدا دەبنە سەراب وەهم). ئەلەمۆنا: کەزانی ئـەویش گرفتـاری جوانییەکـەی بوو، داوای لێبووردنی زەدیجی لێ کرد، ئەویش لـەجیاتی ئـەوەدا، داوای دلّـی ئـەوی کرد.. ئەلەمۆنا: وتی ژوان و بەیەك گەیشتنمان ئـەم شـەو بـێ لـەمالّ خۆمـان کـە ئەستێرەی (جەنیب) دەرهات بفەرموون کارەکەری خۆت لە خزمەتتدایە، پاش ئەویش چوو بۆلای کاهێنی سێیەم و چوارەم، بـۆ هەریـەك لـەوانیش ژوانـی هـەلّهاتنی ئـەم

ئەستێرە و ئەو ئەستێرەی بۆدانان و مۆری لیّ خۆشبوونی زەدیجی لیّ وەرگرتن، ئەوجا چوو بۆلای دادوەرەکان داوای لیّ کردن بۆ کارێکی فرەگرنگ بچنە مـاڵی، ئەوەنـدەی پیّ نەچوو هەموو دادوەرەکان لەماڵی ئەلەمۆنا کۆبوونەوە. ئەلەمۆنا هەرچوار مۆرەی لێبووردنەکەی زەدیجی خـستە بەر دەست دادوەرەکان و وتی: ((تەماشاکەن کاهێنەکان مۆری لێبووردنی زەدیجیان بەچی پـێم فرۆشـتووە ؟) ئـەوجا وتـی خواینتـان هـەبیّ، کەمێکی تر شتی سەیر دەبینن، ئەوەندەی پیّ نەچوو چوار کاهێنەکە یەك لەدوای یەك هاتن هەریەکێکیان کە بەژوور دەکەوت کەچاوی بە هاوتـەکانی خـۆی و دادوەرەکـان دەکەوت واقی وڕدەمـا و خـوێن لـەناو ئەندامـەکانی لەشـیدا رادەوەسـتا و ئـارەقی خەجاڵەتیان دەردەدا. بەوچەشنە ئەلەمۆنا توانی زەدیج لە سووتان رزگـار بکـات و پاداشتی زەدیج بداتەوە. سیتۆك بە بلیمەتی ئەلەمۆنا سەرسام بوو، لەوکاتەوە مارەی کرد و بوو بە هاوسەری.

*　　　*　　　*

# هەڵپەرکێ

دەبوو سیتۆك بۆ بازرگانی لەتەك کاروانەکەیدا بەرەو دوورگەی (سەرەندیپ) بڕوات، بەلاّم لەبەر ئەوەی تازە ئەلەمۆنای مارە کردبوو، لەمانگی پەردەدا بوو، نەدەبوو لەو مانگەدا لە بووکەکەی جودا ببێتەوە، بۆیە داوای لە برادەرە دڵسۆزەکەی زەدیج کرد پێشی کاروان بکەوێ و لەجیاتی ئەو بڕوات. سیتۆك کە ئەو کارەی بە زەدیج راسپارد، لەدڵ خۆیدا وتی: (ئەی بێبەختی خۆم: هەرسەفەرێ دێتە رێم ئەوەندەی تر لە ولاتی خۆشەویستەکەم (ئەستارتیە) دوورم دەخاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ حەقی ئەوانە بدەمەوە کە چاکەیان لەتەك کردووم، کە وای وت هەردوو چاوی پڕبوون لە فرمێسك و هەڵسا کەوتە تەك کاروانەکە و بەرەو دوورگەی (سەرەندیپ) کەوتە رێ. دوای ماوەیەك مانەوەی لەو دوورگەدا، زەدیج لەناو خەڵك و بازرگانەکاندا بەزانا و بلیمەت و راستگۆ ناو دەبرا، خەڵك بەتاسەوەی بینینی بوون، بازرگانەکان کردبوویان بە راوێژکار و دەمڕاس و ناوبژیکاری خۆیان، هەرگرفتێك کەلە نێوانیاندا رووی دەدا بڕیاری ئەو چارەسەربوو، ناوبانگی گەیشتبووە لای پاشای دوورگەکە، بۆیە بڕیاری دا بیبەنە لای بۆ ئەوەی بیبینێ و گوێی لە وتەکانی بێ، کە پاشا دی و لەگەڵیدا کەوتە وتە بۆی دەرکەوت ئەو پیاوە زانا و دانایە، بۆیە کردی بە برادەر و خۆشەویستی خۆی.

زەدیج لەو خۆشەویستییە کەوتە ترسەوە، والێکی دەدایەوە خۆشەویستییەکەی ئەویش وەکو ئەوەکەی (مۆیەدار)ی لێ بێ و تووشی دەردەسەری و نەهامەتی بکات، لەدڵ خۆیدا دەیووت: (شای ئەم دوورگەیە گەلێ منی خۆش دەوێ تۆ بڵێی: ئەم خۆشەویستییە تا سەر بێ، تۆ بڵێی لە کۆتاییدا بەرەو تەنگەژەم نەبات ؟.) پاشا رۆژی دوای رۆژ سەبارەت بە زەدیج لوتف و نەزاکەتی زۆرتر دەبوو، نەیدەتوانی لێی دوور بکەوێتەوە. دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەم پاشای دوورگەی (سەرەندیپ)ە ناوی

(ناپۆسان) ی کوڕی (نوسناب)ی کوڕی (نابسۆن)ی کوڕی (سنبۆسنا)یە کە ئەوانە چاکترین پاشای وڵاتی ئاسیا بوون، ئەوەی ئەو شایە قسەی لەگەڵدا کردبێ خۆشی ویستووە.

ئەم پاشایە هەرچەند لە روودا رووخۆش و وتە رەوان بوو، بەڵام نارەحەتی ناودڵی لە چاویدا دەخوێنرایەوە، نارەحەتییەکەی لەوەوە بوو لەوەتەی پاشا بووە، پیاوێکی راستگۆ و دەستپاکی دەست نەکەوتووە بیکات بە ئەمینداری گەنجینەی وڵات، چەندین جار ئەمینداری گۆڕیبوون یەکێکیان بە دەست پاك دەرنەچوو بوو، ئەوەی دەهات سامانی وڵاتی دەکرد بە دوو بەشەوە، بەشە کەمەکەیان بۆ دەوڵەت تەرخان دەکرد، ئەویتری دەدزرا. پاشا لەبەر خۆیەوە وتبووی کەسی هۆشیارم وەك ئەم زەدیجە دەست ناکەوێ، دەبێ لەو پرسە تێی گەیەنم بەڵکو چارەسەرێکم بۆ بدۆزێتەوە. رۆژێکیان بەیەکەوە دانیشتبوون پێی وت: (گیانەکەم زەدیج تۆ پیاوێکی هۆشیار و خاوەن ئەزموونی، ئەوە بۆ رێگە چارەیەکم بۆ نادۆزیتەوە ئەمیندارێکی دەستپاکی پێبدۆزینەوە ببێ بە ئەمینداری گەنجینەی ئەم وڵاتە.)

زەدیج وتی: ((زۆرئاسانە.. من رێگەیەکی ئاسانت پێ ی دەڵێم چاکترین پیاوی دەستپاك و دڵسۆزی پێ بدۆزیتەوە)). پاشا کە ئەو قسەیەی لە زەدیجەوە بیست لێی چووە پێشەوە و وتی: ((پێم نالێی ئەو رێگەیە کامەیە)).

زەدیج وتی: ((ئەو رێگەیە ئەوەیە: ئەوانەی خۆیان بۆ ئەمینداری گەنجینە هەڵدەبژێرن، هەموویان کۆ بکەرەوە و هەڵیان پەرێنە، هەر کامێکیان هەڵپەرینەکەی رێك بوو واتە لەنجەکەی رێك و راست بوو ئەوە راست و دەستپاکترین کەسە، ئەوە بکە بە ئەمیندار)).

پاشا کە ئەوەی لە زەدیجەوە بیست، زەردەخەنەیەکی بردەوە و وتی: ((ئەوە راستیتە ؟)) رێگەی هەڵبژاردنی وام نەبیستووە، پێم سەیرە، چۆن ئەوەی چاك هەڵپەرێ و چاك لەنجە بکات، ئەو پاکترین کەسە؟))

زەدیج وتی: ((من لەوە دڵنیام ئەو ڕێگەیە پاکترین کەست بۆ هەڵبژاردە دەکـات، بەڵام نازانم ئەو کەسە وریاترین و کارامەترین کەسیشە یان نا.))

زەدیج بە دڵنیاییەوە ئەو ڕێگە چارەیەی بۆ پاشا پێشنیار کرد، لەوەوە پاشا واچوو بە دڵیدا هەموو پەنهانێکی سروشت دەزانێ و دەتوانێ ناخی ناو دەروونی ئەوانـە کـە خۆیان بۆ ئەمینداری هەڵدەبژێرن بخوێنێتەوە. زەدیج کە بۆی دەرکەوت پاشا وا دەزانێ جادووە و خوارق زانە، بۆیە پێی وت: ((من نەجادووم و نەخەوارق زانم، من هەمیشە رکم لە جادوان بووەتــەوە حـەزم لـە کتێبـەکانیان نـەبووە، ئەگـەر خـاوەن شـکۆتان بفەرموون، ئەو هەڵبژاردنە تاقی بکەمەوە بەو ڕێگەیە کەوتم ئەوجا ئەو نهێنییەت بە ئاسانی و بێ پێچ و پەنا بۆ دەردەکەوێ)). شا نابۆسان کە گوێی لە قـسەکەی زەدیـج بوو کە وتی دۆزینەوەی کەسی پاك بەو ڕێگەیە نهێنییەکی وای تیا نییە، لەو قـسەیە گەلێ سەری سوڕما تا ئەگەر پێی بووترایە ئەو ڕێگەیە خەرقی قانوونەکانی سروشتی تیایە.

شا وتی: (چۆن دەتەوێ تاقییان بکەیتەوە وابکە).

زەدیج وتی: (کەواتە لێم گەڕێ چی دەکەم بیکەم، لەمەو دوا بۆت دەردەکەوێ بـۆ وامکرد، زۆر قازانجیشن دەکەی). هەر ئـەو ڕۆژە زەدیـج فـەرمانی دا کـە بـە شـار و لادێکاندا جار بدرێ: ئەوەی دەیەوێ ببێ بە ئەمینداری گەنجینـەی شـا، بـا جلێکـی هەورشیمین لەبەر بکات و لەیەکەم ڕۆژی ئەهەنگدا لە کۆشـکی شـا ئامـادەبێ، کـە یەکەم ڕۆژی مانگی ئەهەنگ هات ئەوەی خـۆی هەڵبـژاردبوو ئامـادەبوو، ژمارەیـان شەست و چوار کەس بوو، زەدیج ژوورێکی ڕازاوەی بۆ هەڵپەرکێکە ئامـادە کردبـوو، دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەو ژوورە لەسـەر دالانێکـی تاریـك بـوو، دەرگـاوانی شـا یەکەیەکەی ئەو کەسانەی بـەو دالانـە تاریکـەدا ڕەوانـەی نـاو ژووری هەڵپەرکێکـە دەکرد، هەریەك ماوەیەکی دەدایە ئەوجا یەکێکی تری ڕەوانە دەکرد، شا کـە نهێنـی ئەو تاقیکردنەوەی بۆ دەرکەوت بە تەشت زیو و زێڕی لە دالانەکەدا دانا:

که هەموو لە وێوە چوونە ناو ژووری هەڵپەرکێکە، دەهـۆڵ و زورنـای هەڵپـەرکێ گەرم بوو، هەموو دەستیان بە هەڵپەرین کرد یەکێکیان نەبێ هەموو بەرێك و پێکـی هەڵ نەدەپەرین، هەموو سەریان شۆر دەکرد و پشتیان کوور بوو، زەدیج کـە ئەوانـەی دی بە گوێی شادا چپانی و وتی سەیرکە ئەوانە هەموو دەست پیسن، ئەوەی کە بەلار و لەنجە هەڵدەپەرێ و قیت راوەستاوە و بەگوێرەی بـەزمی مۆسـیقاکە دەجەوڵێتـەوە، ئەوە دەست پاکە، پاشا کە ئەوەی دی، فەرمانی دا ئەو کەسە بکرێ بـە ئەمینـداری گەنجینەی شا. ئەوانی تر ناپاك بوون چونکە هەریەکەیان لە دالآنە تاریکەکەدا باخـەڵ و گیرفانی لە زیو و زێر پڕکردبوو لەبەر قورسی و زرە نەهاتنیان نەیاندەتوانی بەرێکی هەڵپەرکێ بکەن. شا زۆر بەوە دڵگران بوو کە دی شەست و چوارکەسـی سـەما کـەر شەست و سێیان دزبن، لەوا سروشتی مرۆڤی بۆ دەرکەوت چـۆنە. لـەو رۆژەوە دالآنـە تاریکەکە ناونرا تونێلی داو.

ئەگەر ئەو رووداوە لە ولآتی ئێراندا رووی بدایـە هـەر شەسـت و سـێ کەسـەکە زیندانی دەکران، یان ئەگەر ئەو رووداوە لەهەر ولآتێکی تردا رووی بدایە ئەوانە دەبوو سێ جای ئەوەندەی دزیبوویان خەرجی بدەن بەدادگا، بەبێ ئەوەی شتێ بۆ گەنجینـەی پاشا بگەڕێننەوە. ئەگەر لە هەندێ ولآتی دیکەشدا رووی بدایە، دزەکان بۆیان هەبوو بەرگری لە خۆیان بکەن و جامی تووڕەیی شا بەسـەر ئـەو کەسـدا بـڕژێنن کـە دزی نەکردووە کەچی لە ولآتی (سـەرەندیپ)دا ئـەو دزانـە نەدرانـە دادگـا، تـەنیا ئـەوەی دزیبوویان لێیان وەرگیرایەوە و درایـەوە بـە گەنجینـەی شـا، چـونکە شـا (نابۆسـان) پیاوێکی رەند و میهرەبان بوو.

بە ئەندازەی ئەو پارە دزراوانە کە گەرانەوە بۆ ناو گەنجینە، شا (نابۆسان) ئەوەندە زێری بە زەدیج بەخشی)، ئەویش بەو زێرانە کە شای سەرەندیپ پێی بەخـشی، چـەند کەسێکی بە کـرێ گـرت، بـۆ ئـەوەی بـەرەو بابـڵ بـڕۆن هـەواڵی خۆشەویـستەکەی ئەستارتیە بۆ بێننەوە، لـەکاتی فەرمانـدان بـەو پەیامبەرانـە و ناوهێنـانی بابـل و ئەستارتیە دەنگی لە قورگیا گیرا و خوێنی لاشەی لە هەموو دەمارەکانیدا بەرەو نـاو

دڵی گەڕایەوە، پەیامبەرەکان بەرەو بابل سواری دەریا بوون، تا لەچاو گوم بوون بە شوێنیاندا دەیروانی، زەدیج بەرەو کۆشکی شا گەڕایەوە، وای زانی لە شوێنێکی چۆڵدایە و کەس لەو ناوەدا نییە، لەبەر خۆیەوە سۆزی بۆ دڵ و خۆشەویستی دەکرد، شا کە گوێی لە زەدیج بوو سۆز بۆ خۆشەویستەکەی دەکات: وتی: (خۆشەویستی ؟) من گیرۆدەی خۆشەویستم، ئەوە چۆنت زانی سەرچاوەی خەمی من ئەڤینە، بەڕاستی تۆ پیاوێکی مەزنی، چۆنت زانی من گیرۆدەی دڵم، تکات لێ دەکەم، وەکو چۆن ڕێگە چارەی ئەمینداری دەستپاکت پیشان دام، وەهاش ڕێگەیەکم پیشان بدە کە ژنێکی داوێن پاك و شەریفی پێی بدۆزمەوە).

زەدیج بەخەیالی داچووبوو، کاتێ ئەو وتەی لە شاوە بیست هاتەوە سەرخۆی و پەیمانی بەشادا کە لەو رووەشەوە یارمەتی بدات، هەرچەند یارمەتی دان لەبواری دڵداری گەلێ ئەستەمە تا یارمەتی دان لەبواری ئابووریدا.

* * *

## چاو شین

نابۆسـان قسەی بۆ زەدیج دەکرد لەناو ئاخاوتنەکەیداٌ وتی: (لەش و دڵ) زەدیج کە گوێی لەو دوو وشە بوو خۆی پێ ڕانەگیرا وتەکەی لەدەم بڕی و وتـی: (زۆر سـوپاسـت دەکەم کە نەت فەرموو ((هۆش و دڵ)) ئێمەی خەڵکی وڵاتی بابل جگە لە ((هۆش و دڵ)) شتی تر بەکار ناهێنین، لەڕۆژێکدا سەدان جار ئـەو وشـە بەیەکـەوە بـەکاردێن، کتێبەکانیش پڕن لەباسی ئەو دوو وشەیە کەچـی نـە هـەواڵی دڵ نـە هـەواڵی هـۆش ناپرسن.. فەرموو گەورەم وتەکەت تەواو بکە. نابۆسـان وتـی: ((جەسـتە و دڵـم بـۆ خۆشەویستی دروستکراون، یەکەمیان لەخۆی ڕازییە، ئێستا لەم کۆشکەمدا سەد ژنی جوان هەن، هەموو بۆ فەرمانەکانم دەستە نەزەرن، چیم گەرەك بێ ئامـادەن، هـەموو جوان و نازدارن، هەموو حەزیان لە منە، یان وا خۆیان نیشان دەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا دڵم زۆر لە بەختەوەرییەوە دوورە، بۆم دەرکەوتووە ئەو ژنانەم چێژ لەشـای سـەرەندیپ وەردەگرن نەك لە نابۆسـان، هـیچ ناپـاکی و داوێـن پیـسییەکم لێ نـەدیون، کەچـی لەناویاندا یەکێکیانم بەراسـتگۆ و دڵـسۆز نەهاتۆتـە بەرچـاو، مـن یـەکێکم دەوێ دڵسۆزم بێ، ئەگەر لەناو ئەو سـەدەدا دڵـسۆزێکم بـۆ بدۆزیتـەوە، ئـەوانی دیکـەیان پێشکەش بەتۆیان دەکەم، وەرە سەیری ئەو سەد جوانە بکە، بزانە کامیان دەبێتە ئەو گەنجینەیە کە ببێ بە شا بانۆی ئەم کۆشکە و، دڵنیام بکات کەمنی لە دڵەوە خـۆش دەوێ)).

زەدیج وتی: "گەورەم وەکو لە تاقیکردنەوەکەی پێشوودا ئازادت کردم لێرەشدا لێم گەڕێ، ئەو زێرانە کەلە داڵانەکەدا دامان نان، با لەم تاقیکردنەوەشدا بەکاریان بێـنم، لە دواییدا هەموو دەگەڕێنەوە بەردەست و یەك پوول زەرەر ناکەیت."

شا وتی: "ئازاد بە، چی دەکەی بیکە."

زەدیج سی و سێ پیاوی کورتەی پشت کۆم و سی و سێ گەنجی جوانی ناو کۆشکی شای خڕکردنەوە، هەروەها سی و سێ پیاوی کاهێنی دەم لووسی هێنان، بەهەریەك لە پیاوە کورتیلەکان چوار هەزار زێڕی دانێ، لەپاشدا هەموویانی بەرەڵڵای ناوکۆشك کردن و ئازادی دانێ کە هەریەك بە ئارەزووی خۆی بچێتە لای یەکێك لە شاژنەکان، یەك ڕۆژی نەخایاند هەریەك لە پیاوە کورتیلەکان بەهۆی زێڕەکانیانەوە بەختیاربوون، بەلام کوڕە گەنجەکان لەبەر ئەوەی جگە لە جوانی خۆیان شتی تریان شك نەدەبرد، دوای دوو ڕۆژ دەرگای گەنجینەیان خستە سەرپشت، کاهێنەکان جگە لە زمان لووسی چیتریان نەبوو، سی و سێ لەژنە ئایینداره کە ناز و نەزاکەتیان بۆ کاهێنەکان دەنواند هەرچەند ئەو خانمانە درەنگ خۆیان دابەستەوە، بەلام لەدوایدا هەموو لەسەر گازرای پشت بۆ کاهێنەکان تەخت بوون.

پاشا لە کونێکەوە دەی دی کە چۆن ئەوت و نۆلە خانمەکانی تەختی زەوی کران، تەنیا ژنێکی گەنج مایەوە کە شا قەت نزیکی نەکەوتبوو، سێ پیاوی کورتیلەی یەك لەدوای یەکی ناردنە لای، زیاتر لە بیست هەزار دیناریان دایە کە خۆی بە دەستەوە بدا، بەلام ئەو لەسەر هەڵوێست و شەرەفی خۆی مایەوە، پێکەنینی بەو پیاوە کورتیلە کووڕانە دەهات کەوایان دەزانی پارە بە ئامانجیان دەگەیەنێ. دوو لەخزمەتکارەکانی کەلە هەرتی گەنجیدا بوون ناردینە لای، دەیووت شا لە هەموو جوانێ جوانترە، پاش ئەوانیش کاهینێکی دەم لووسی ناردە لای، پاش ئەویش بەبەتین ترین کاهێنی نارد هیچ کامیان نەیتوانی فریوی بدەن، یەکەمیان بەچەقەباز و دووەمیان بە زرتە زەلام هاتنە پێش چاوی دەیووت:

(دڵ هەموو شتە، هەتا ماوم بۆ کەسێ کورتیلە لەبەر پارە خۆم نادۆڕێنم یان بۆ جوانی گەنجی خۆم سووك ناکەم، بۆ کاهێنی جادووگەریش حەیای خۆم نابەم، بەڵکو تەنیا نابۆسانی کوڕی (نۆسناب)م خۆشدەوێ، چاوەڕوانی دەبم ئەویش منی خۆشبووێ)، کە شا گوێی لەوخانمە گەنجەبوو وای وت، سەرسام بوو، دەستبەجێ نیانی و خۆشەویستی بۆ ئەوخانمە لەناو دڵیدا شەوقیان دایەوە، چی پارەی بە پیاوە

کورتیلەکانی دابوو هەمووی لێ سەندنەوە و پێشکەشی ئەو کچە گەنجەی کرد کە ناوی (فالیدا) بوو.

شا کە بۆی دەرکەوت ئەو کچە پاکە و لە جوانیشدا شای جوانانە بۆیە دڵی خۆی دایە، وای دەزانی هەموو جوانی لەناو جوانی فالیدا دا تواوەتەوە.

مێژووی جوانی ناماخاتە هەڵەوە ئەگەر بڵێین: دوورگەی سەرەندتپ تا ئەو کاتە دڵرفێن و چاو جادووی وەك فالیدای نەدیبوو، ئەو ئافرەتە ئەگەر چی ئیکلامی شاهانەی نەدەزانی بەلاّم لە هەڵپەرکێ و سەماکردندا هەرلەخۆی دەوەشایەوە. ئەو دەنگ و ئاوازە پڕ سۆزانە باڵەوێ راواستن دەتووت لەگەرووی شمشاڵێکی بلوورینەوە دەرژانە سەر پەردەی دڵ و بیستن، گفتوگۆ شیرینەکەی لە قاڵبدان و دارشتنی بلیمەتی و هۆشی تەواو بوون. نابۆسانی گەڵێ خۆشدەویست، ئەویش وەك بت دەیپەرست، بەلام چاوی شین بوون، ئەو چاوشینییەی بوو بەهۆی چارەڕەشی بۆی، یاسایەکی کۆنی بابلییەکان هەبوو لەسەر پاشای قەدەغ کردبوو، ژنی چاوشین مارە بکات، کە یۆنانییەکان بەچاوی ئەو جۆرە ژنانەیان دەووت ژنی چاو ((پیّڵەگا))(٦).

وەنەبێ ئەو یاسایە لەسەر بنەڕەتێکی راست دانرابێ. بەڵکو پێنج هەزار ساڵ لەوەوبەر سەرۆکی کاهێنەکانی دوورگەی سەرەندیپ ئەو یاسایەی داناوە، بۆ ئەوەی شای یەکەمی ئەو دوورگە واز لە دۆستێکی چاوشینی خۆی بۆ ئەو کاهێنە بینێ، هەر لەوکاتەوە ئەوەی لەناو دەستووری دەوڵەتدا چەسپاند کە نابێ شا ئافرەتی چاوشین بکات بە هاوسەری خۆی، دەنا خۆشی و وڵاتەکەی تووشی کارەسات و مەحف بوونەوە دەبن.

لەناو خەڵکی دوورگەکەدا، لە ناو هەموو چین و توێژا لێکیدا بڵاو بوەوە کە شا ئافرەتێکی چاوشینی کردووە بە هاوسەری خۆی، کەواتە رۆژی نەهامەتی و شەڕ نزیك بووەتەوە، سروشت، هەموو سروشت گەیشتووەتە سەر رۆخی بڤەیەکی تۆقێنەر.

---

٦- پێڵەگا ---- المها – مانگایەك کەچاوی لە چاوی ئاسك بچێ.

چونکە نابۆسانی کوڕی نۆسناب دڵی چووتە ژنێکی چاوشین، پیاوە کورتیلەکان، بازرگانەکان، کاهێنەکان، ژنە ڕەشتاڵەکان قوریان دەپیوا، دوورگەکەیان پڕ لە سکالا و پڕوپاگەندە دژ بە شا کرد. گەلێکی دڕندەی نەزان کە دەکەوتە سەرووی دوورگەی سەرندیپەوە، کە زانییان هەموو گەلی سەرەندیپ سکالا لە دەست پاشا دەکەن، دەرفەتیان وەرگرت و پەلاماری وڵاتی (سەرەندیپ)یان دا، شا داوای یارمەتی لە خەڵك کرد، کاهێنەکان کە نیوەی وڵاتەکەیان لەژێر دەستدابوو، لەجیاتی ئەوە بە سامانەکەیان یارمەتی پاراستنی نیشتمان بدەن، وتیان ئێمە جگە لە نزا و دوعا گوێی شتی ترمان نییە، وا ئێمە دەستمان بەرەو ئاسمان بەرز دەکەینەوە بەڵکو ئاسمان نزامان قەبووڵ بکات و ئەو وەیەمان لەسەر لابدا، نەقارەیان دەژەند، دەپاڕانەوە، بەڵام وڵاتیان بۆ تاڵان و وێران بوون پشت گوێ خست. نابۆسان کە ئەوەی زانی بە زەدیجی وت: (برای دڵسۆزم دەتوانی لەم کێشەیە کە تێی کەوتووم ئەمجارەش ڕزگارم بکەی ؟) زەدیج وتی: (زۆر ئاسانە، شتێکی وا دەکەم هەموو سامانی کاهێنەکانت بەئاسانی بێتە بەر دەست، تۆ هەر بەرگری لە سامانی خۆت بکە، زەوی و زار و سامانی کاهێنەکان واز لێ بێنە، با هەموو بە سووتان و تاڵان بڕوات).

شا کە زانی پێشنیازەکەی زەدیج زۆر بە جێیە، بە گوێی کرد. کاهێنەکان کە زانییان شا سامانەکانیان ناپارێزێ، هەموو پەنایان بەر شا هێنا، تیپە مۆسیقایەکی ئامادەکرد، فەرمانی دا مۆسیقا بژەنن دەست بەرەو ئاسمان بەرز بکەنەوە و بپاڕێنەوە ئاسمان خۆیان سامانەکانیان بپارێزێ.

کاهێنەکان کە زانییان دەست پانکردنەوە بەرەو ئاسمان پاداشتی هەر دەست پانکردنەوەیە بەرەو ئاسمان، کە ئەوەیان زانی ئەوجا هەموو سامانەکەی خۆیان خستە بەر دەستی شا بۆ ئەوەی بیانپارێزێ، بەو جۆرە شا توانی وڵات لە کاولکردن و تاڵانی دڕەندەکان بپارێزێ و ئاسایش هەموو وڵات بگرێتەوە. ئەو چاکە و ڕاوێژکارییانە کە زەدیج پێشکەش بە شای کردن هەموو بوون بە بەڵایەك بەرکی زەدیجیان گرتەوە و هەڕەشەیان لە کاهێن و ئافرەتە ڕەشتاڵەکان و هەموو پیاوە کورتیلە و بازرگانەکان

پەیوەندییان بەست و سوێنیان بۆ یەکتری خوارد کە حەقی خۆیان لە زەدیج بکەنەوە و ژیانی لێ تاڵ بکەن.

زەردەشت پێغەمبەر وتوویەتی: ئەو چاکانە کە دەکرێن لەناو ژووری چاوەروانیدا دەمێننەوە، کەچی شك وگومان لێیانەوە بۆ دەرەوە دزە دەکەن.

هەر رۆژێ جۆرە بوختانێکیان بۆ زەدیج دەتاشی و داویان بۆ دەنایەوە، بوختانی یەکەم چارەدەکرا، بۆختانی دووەم کەمێ پەردەی دڵی دەرووشان بوختانی سێیەم بریندارى دەکرد، بەڵام چوارەم کوشتنی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

زەدیج ترسێکی گەورەی لێ نیشت، ئەو کات لە فرۆشتنی شتومەکە بازرگانییەکانی برادەرەکەی سیتۆك بوو بووەوەو قازانجێکی چاکی کردبوو، بۆیە نیازی هاتە سەر ئەوە بەرەو عەرەبستان بگەڕێتەوە، بڕیاری دا لەوێوە سەردانی بابل بکاتەوە بۆئەوەی سۆراخێکی ئەستارتیە بکات، لەبەر خۆیەوە دەیووت: ((کە لە سەرەندیپ دەمێنمەوە کاهێنەکان تووشی نازارم دەکەن، ئەی بۆ کوێ بچم، بەرەو میسر دەچم دەبمە کوێلە، بۆ ولاتی عەرەبان دەگەرێمەوە بەناگرِ دەم سووتێنن، بەرەو بابلیش بگەرێمەوە سێدارەی خنکان چاوەروانم دەکات، هەرجۆر بووە دەبێ لە چارەنووسی ئەستارتیە حاڵی ببم، بابرۆم بزانم چارەنووسی رەش چ داوێکی تری بۆمان ناوەتەوە.)).

✲ ✲ ✲

## جەردە

زەدیج بەرەو بابل ڕێگەی گرتە بەر کە گەیشتە سنووری بەتراو سوریا، لە دوورەوە کۆشکێکی بڵندی لی دەرکەوت، ئەو لەو دەشتەدا لەتەك خزمەتکارەکەیدا دانیشتبوو بیری لە کایەکانی ڕۆژگار دەکردەوە کە سەری هەڵبڕی، لەهەر چوار دەورەی کۆشکەکەوە زەلامی بەشیروتیری لێ ڕاپەرین، هەر چوار دەورەیان دا و بەسەریا نەراندیان و وتیان: (ئەی کابرای ڕێبوار هەرچیت پێیە بۆ ئێمەیە، سەروگیانت بۆ سەرکردەمانە).

زەدیج کە ئەوەی لێ بیستن، شیرەکەی لێ هەڵکێشان و لێیان هاتە دەس و خزمەتکارەکەشی بە ئازایانە وەکو خۆی لێیان ڕاپەڕی و، هەر یەکەیان کە دەهاتنە پێشەوە سەرەوخوونی دەکرد و لە خوێنی خۆی دەگەوزا، جەردە پێپەتییەکان کە زانییان ئەو دوو کەسە گەڵێ بە دڵێرانە دەجەنگن، ژمارەیەکی تریش بۆ پاڵپشتییان هاتن، ئەمانیش بە ئازایانەتر بەرگرییان لە خۆیان دەکرد، بڕیاریان دابوو بە ئازادی بمرن نەك بکەونە ژێر دەستیان، دیارە دوو کەس دژ بەژمارەیەکی زۆر ئەوەندە درێژە ناکێشێ. سەرکردەی ئەو جەردانە کە ناوی (ئاربۆجاد) بوو لە پەنجەرەی کۆشکەکەیەوە سەیری ئەو ڕووداوەی دەکرد، کەدی ئەو دووکەسە نابەزن و توانییان زۆربەی پیاوەکانی ببەزێنی، خۆشەویستی زەدیج چوو بە دڵیدا، لە کۆشکەکەی هاتە دەرەوە و ڕووی کردە مەیدانی شەڕەکە و پیاوەکانی خۆی دوورخستنەوە و ڕووی کردە زەدیج و وتی: (ئەوەی بەم دەڤەرەدا گوزەر بکات، یان ئەوەی لە دەرەوی زەوی مندا گوزەر بکات هی منە، ئەوە قانوونی منە، لەبەر ئەوە حوکمی ئەو قانوونەم لەسەر تۆ لابرد).

ئاربۆجاد زەدیجی بردە ناو کۆشکەکە، دراوی لە برادەرەکانی کرد کە بایەخی پێبدن و ڕێزی بگرن. ئەم ئاربۆجادە، خاوەنی کۆشکەکە بوو، سەرکردەی ئەو جەردە

١ عەریانە بوو، هەرچەند پیاوێکی تاوانبار بوو، جاروبار چاکەی دەکرد، لەسەر دزین و رووتکردنەوەی خەڵك دەژیا، دەستی لە وێرانکاری و خوێنمژین و کوشتن نەدەپاراست، جاروبار حەزی لە دەهەندەیی و میهرەبانی هەبوو، زۆر ئازا و وریا بوو، حەزیشی لە دەمەتەقێ دەکرد، کە ئێوارە هات داوای لە زەدیج کرد لەگەڵیدا ئامادەی خوانی ئەو ئێوارەی بێ، زەدیج بۆی دەرکەوت ئەو پیاوە چەند خەسڵەتی خراپەی هەبوون ئەوەندەش خەسڵەتی چاکەی لێ بەدی دەکران و کەسێتی لە کۆمەڵە سیفەتێکی دژوار پێکهاتبوو، وتەکانی نیشانەی ئەوەبوون کە کەسێکی چالاك و زیت و زرنگە، لەسەر خوانی نان خواردن بە زەدیجی وت: (ئامۆژگاریت دەکەم بەگوێم بکە: ئەگەر دەتەوێ ببێ بە شتێ، ببە بە یەکێك لە پاسەوانەکانم، لەوانەیە رۆژێك دێت وەکو منت لێ دێ، ئەم پیشەیە چ خراپەیەکی تیایە، ئەوەی بتەوێ بە ئاسانی دێتە بەردەستت) زەدیج پێی وت: دەتوانم بپرسم لە کەیەوە دەستت داوەتە ئەم پیشە پاکە؟.

ئاربۆجاد (لە هەرەتی گەنجییەوە، لە پێشەوە لەبەر دەستی پیاوێکی عەرەبی کارزان و وریادا کارم دەکرد، بەڵام ئەو پیشەیەم لەبەرچاو کەوت، دڵم زۆر پەست بوو بەوەی کە ئەم گیتییە بەم گەورە و بەرینییە بۆ مرۆڤ دروستکراوە کەچی منی لێ بێ بەشبووم، لەوباردوە خەمی خۆم بۆ پیرێکی عەرەب گێرایەوە، وتی: کورم نا ئومێد مەبە، ئەگێرنەوە لە کۆن زەماندا دەنگە بەردێك لەناو دەشتێکی کاکی بەکاکیدا دەبێ، سکالا لە بارەی خۆی دەکات کە بۆچ لەو سارادا کەوتووە و کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، چەند سالێکی پێ نەچوو دەنکە بەردەکە بوو بە پارچە ئەڵماسێك، وا ئێستا هێژاترین پارچەیە لە چقەی شای هیندستان دراوە، منیش ئەو دەنکە بەردەبووم، بێبەشی ناو ئەم جیهانە بووم، یەکەم جار کە ئاورم لێدرایەوە دوو مایینم دزین، دوای ئەوە چەند برادەرێکم دۆزینەوە. هەمووم خستنە دوای خۆم و دەستمان دایە رووتکردنەوەی کاروانی بچووك، کە زانیم پەلاماری هەر قافڵەیەك دەدەم بە ئاسانی دەستی بەسەردا دەگرم، وردە وردە پلەی خۆم بەرز کردەوە، تا بووم بە چقەی سەری هەموو جەردە و رێگرەکان، وا دەبینی چۆن بەشی خۆم لەم جیهانەدا وەرگرتووە،

ڕەنگە چەندین جاری ئەو بێبەشییەی ژیانم خۆشیم دیــووە، وا ئێـستا لـەناو خەڵکـدا پایەم بەرزە و فەرماندەی هەموو ڕێگرەکانم، ئەم کۆشکەشم بە خورتی داگیرکــردووە، حوکمداری سووریا چەندین جار هەوڵی داوە لێم بیسێنێتەوە بـەڵام نـەیتوانیوە، مــن گەلێ لەو سامانم زۆرترە، ئیدی چۆن پێی دەکـرێ لـێم داگـیر بکـات، هـەر بایـەخی نادەمێ، جگە لەوەش دەڤەرێکی بەرینی ئەم سەرزەوییە لەژێر دەســەڵاتی منداێــە و زەوتم کردووە.

حکومداری سووریا پەیمانی دامێ کە بکات بە سەرکاری ئەم دەڤەرە، کە هــەموو باج و داهاتەکەی کۆیکەمەوە و بۆی بنێرم، واخۆم هەموو باج و خەراجەکـەی بۆخـۆم ئەگرم، هەرگوێشی نادەمێ شـاکێیە و حوکمـدار چ کەســە، مــن خـۆم شـام و خـۆم حوکمدارم.

شا موبەرداریش خەزنەداری دەوڵەتی بابلی لەگەڵ چوارکەسدا ناردبووە سەرم کـە لە سێدارەم بدەن، لەمە گەیشتن هەرچـوار زەلامەکـەم لەبـەر دەسـتی خەزنەدارەکـە سەربڕی، کەنۆبەی خەزنەدارەکە هات پێم وت: (ئەگەر نەتکوژم چەند قازانج دەکـەی) وتی ئەگەر نەمکوژی واتە سێ هەزار زێرت پێ بەخشیوم، پـێم وت ئەگـەر لای مــن نیش بکەی سێ هەزار زێرت زیاتر دەستدەکەوێ، وا ئێستا هاوکاری دەستەراسـتمە و یەکێکە لەپیاوە دڵسۆزەکانم، ئەگەر تۆش بەگوێم دەکەی: دەبییە پیاوێك لە پیاوەکانم و سەرکەوتوو دەبی، ئەوەش بزانە ئـەمڕۆ ڕۆژی گـرتن و بـڕین و دەسـتکەوتە، دوای کوشتنی موبەدار ڕۆژ بووە ڕۆژی رووتانەوە و بگرە و بکوژە، کەس لەکەس ناپرسێت.

زەدیج کە ئەوەی بیست ڕاچڵەکا و یەکسەر وتی:

(موبەردار کوژرا!!؟ ئەی شاژن ئەستارتیە چی لێ هات ؟)).

ئەربۆجاد وتی: ((نازانم ! ئەوەنـدە دەزانم: شـێت بـوو لـە دواییـدا کـوژرا، دوای کوشتنی ئەو بابل تێکچوو، ئێستا بووە بە شوێنی کوشتن و برین، سەرانـسەری وڵات بێسەروبەر بووە، دەرگامان لێ کراوەتەوە کەس ناتوانێ بێتە بەر ڕێـم هـەموو کـەس لەدوور و نزیکەوە ناوی من دەبەن)).

زەدیج وتی: ((دەستە داوێنت دەبم، پێم نالێی شاژن ئەستارتیە چی لێ هات)).
ئاربۆجاد وتی: ((لام وایە، کەوتە لای سالاری ئۆرکانیا، ئەگەر نەکوژرابێ لای ئەوە، رەنگە یەکێك بێ لە کەنیزەکە کوێلەکانی، من ئەوەندە بە دەنگوباسی ئەو شتانەوە خۆم خەریك ناکەم، من خەریکی پیشەی خۆمم. لە چەندین تالانیدا چەندان ژنی جوان جوانم دەستدەکەوتن، هەمووم بە نرخێکی کەم دەفرۆشتن، هەر ژنێ شۆخ و بەژن و بالا جوان نەبێ ئەوەندە گوێی نادەمێ، هەر پرسیاریشیان لێ ناکەم کێیە و ژنی کێ بووە، کەی من گوێ بەسایە و پایە دەدەم، لەوانەیە ئەو شاژنە تۆ لێی دەپرسی ئافرەتێکی ناشرین بێ کەس نەی کڕێ، رەنگە بەر تالانی من کەوتبێ و فرۆشتبێتم، یان لەوانەیە مردبێ، ئەوشتانەم بەلاوە مەبەست نییە، تۆش وەك من بە: گوێ بەو شتانە مەدە)).
ئاربۆجاد ئەو قسانەی دەکردن پەیتا پەیتا مەی دەخواردەوە و قسەی تێکەڵ و پێکەڵی دەکرد، زەدیج هەوڵی دا لە بارەی ئەستارتیەوە شتێك بزانێ، جگە لەوەی کە وتی شتێکی تری نەزانی.
زەدیج کە زانی شا موبەدار کوژراوە و شا ژنیش کەس شوێنی نازانێ واقی ورما و بەسەر مێشکی پڕ لە غەم و کەسەردا کەوت.
ئاربۆجاد دەیخواردەوە و دەینەڕاند، لەناو بێ هۆشیدا گەوزابوو، دەیووت: کێ هەیە لەو جیهانەدا بەقەد من بەختیار و کامەڕان بێ، داوای لە زەدیج دەکرد کەوەك ئەو خۆی بەختیار و دڵخۆش بکات، ئەوەندەی خواردەوە کەوت و لەناو دەریای تاریکە خەودا نقوم بوو، چی دڕك و پەیکولی ئازار و خەموو ناسۆری رۆژگاربوون لەناو دەروونی زەدیجدا کەڵەکەیان کرد، لەدڵ خۆیدا دەیووت: ((شا موبەدار شێت بوو، کوژرا!؟ حەقە شین و زاری بۆ بکەم، دەوڵەتێکی وەك بابل تێك چوو!؟ جەردەیەکی رێگر خۆی بە بەختیارترین کەسی ئەم سەرزەوییە دەزانێ، داد لە دەست رۆژگار، هاوار بۆ چارەنووس، جەردەیەك بەختیار دەکات و جوانترین وێنە کە سروشت نەخشاندبێتی بە پیسترین جۆری مردن دەیمرێنێ، یان گێرۆدەی ژیانی کوێلایەتی و لەمردن خراپتری دەکات! ئەی ئەستارتیە داخۆ چیت لێ هاتبێ ؟ ! کە بەیانی خۆر

هەڵهات، بەناو دەست و پەیوەندی کۆشکدا دەگەڕا، تووشی هەریەکێ دەبوو پرسیاری ئەستارتیەی لێ دەکرد، بەڵام کەس دەرفەتی ئەوەی نەبوو وەڵامێکی بداتەوە، چونکە ئەوشەوە دابوویان بەسەر هۆزێکدا، هەموو خەریکی وەرگرتنی بەشە تاڵانی خۆیان بوون، لەناو ئەو تێکە و لێکەدا توانی روخسەت لە ئاربۆجاد وەربگرێ و خۆی ئازاد بکات، دەستبەجێ رێی دەرچوونی گرتەبەر، سەری پڕ لە خەیاڵی نێش و ئازاری دایە بەر رێ و تێی تەقاند، رۆیشت، ناو هۆشی کلۆڵی پڕ بوو لەبەسەرهاتی ئەستارتیە و شای بابل و دوستی خۆشەویستی کادۆر و ئەو رێگرە بەختەوەرە و ئەو ژنە هەڵە و هەرزەیە کە بابلییەکان لەسەر سنووری میسر رفاندیان، هەروەها هەموو کارەساتەکان لەبەر وێنایدا ببوون بە تابلۆ و لێی جیا نەدەبوونەوە.

*　　*　　*

# راوچی

زەدیج بەرەو بابل کەوتــە ڕێ، چــەند قۆناخێــك لــە کۆشــکەکەی ئاربۆجــاد دوور نەکەوتبووەوە، تووشی چــەند وردە جۆگەلــە و مێرگێــك بــوو، ڕاوکــەرێکی لەکــەنار جۆگەیەکدا دی، بەدەستێکی شلەوە داوی تۆڕە ماســییەکی فرێــدراوی نــاو ئاوەکــەی گرتووە، و بە پشتا کەوتووە و چاوی بڕیوەتە ئاسمان و سکالآی بەخت و ژیانی کلــوڵی خۆی دەکات و دەڵێ: (من کلۆڵترین کەسی ئەم سەرزەوییەم، مــن لای خــەڵکی بابــل ناودارترین دروســتکەری پــەنیری ســپی بــووم، ئەوەنــدەی پــێ نەچــوو مــاڵ وێــران و سەرگەردان بووم، کێ ژنی جوانی وەك هی من هەبوو، پیاوێکی خراپ هەڵی خەڵەتاند و بردی، دوای ئەو ئەوەی بۆم مایەوە خــانووێکی بــچووك بــوو بەبەرچــاوی خۆمــەوە تالآنکاران وێرانیان کرد، وا ئێستا بە پووش و پلاش کۆڵێتێکم دروست کرد بۆ ئەوەی خۆمی تیا حەشار بدەم، قوتی ڕۆژانەم ماسی گرتنــە، ئــەوەتا بــە درێــژایی ڕۆژ یــەك ماسی ناکەوێتە ناو تورەکەمەوە، ئەی تۆڕەکەم جارێکی تر ڕاوت پێناکەم، لــەجیاتی تۆ خۆم فڕێ دەدەمە ناو ئاوەکەوە، ژیانی وەها مردن چــاکترە، ئــەوەی وت و هەڵــسا خۆی فڕێ بداتە ناو ئاوەکەوە. زەدیج کە گوێی لــە ســکالآی ئــەو پیــاوە بــوو لەبــەر خۆیەوە وتی: (بۆ کەس لەم جیهانەدا هەیە وەك من کلۆڵ و چارەڕەش بێ).

زوو پەلاماری دا نەیەڵێ ئەو کــابرا خــۆی فــڕێ بداتــە نــاو ئاوەکــەوە، گرتــی و بە نەرم و نیانییەوە، وەك پرســەی مردووێــك بکــەی پرســیاری لێ کــرد، مــرۆڤ کــە هاودەمێکی کوێرەوەری وەك خۆی دەستکەوت، ئازاری کوێرەوەرییەکەی لەسەر سووك دەبێ و دەزانێ لەم دونیایەدا تــەنیا نییــە، ســەرچــاوەی ئــەو بیرۆکەیــە لــە وتەیــەکی زەردەشت پێغەمبەرەوە هاتووە کە دەڵێ: ((پیاوی لێ قەوماو کــە هــاودەمێکی وەك خۆی دەست کەوت هەست دەکات هەر ئەو چارەڕەش نییە، چارەڕەشی هەر یەکێکیان هی ئەویتر دادەپۆشێ و هەست دەکــات بەختــەوەری کەســی بــەختیار ســووکایەتییە

بۆکلۆڵییەکەی و ئەوەندەی تر باری قورس دەکات، دوو چارەڕەش کە یەکیان گرت وەکو دوو داری نیمچە ڕێخە هەڵکنراو وەهانە لەبەر ڕەشەبادا هەریەك لەنگری ئەویتر دەگرێ)).

زەدیج بەکابرای راوکەری وت: (بۆ وا خۆت بەدەست کلۆڵییەوە داوە؟)) راوچییەکە وتی: ((چارم ناچارە، ئەی وانەکەم چی بکەم، زوو مـن لـە دێـی ((دیرلبـاك))دا پایەدارترین کەسی ئەو دێیە بـووم، بـەتامترین پـەنیری ولاتـی بابـل مـن و ژنەکـەم دروستمان دەکرد، شاژن ئەستارتیە و شالیار – وەزیر–ی بەناوبانگ زەدیج لەهـەموو کەس زیاتر حەزیان لە پەنیرەکەمان دەکرد، جارێکیان شەش سەد سـەلکە پـەنیرم بـۆ کۆشکیان برد، رۆژێکی تر چوومەوە کە نرخەکەیان وەربگـرم کـە گەیـشتمە کـەناری شاری بابل پێیان وتم بۆکوێ دەچی؟! ئەی نەتان زانیوە زەدیـج و ئەسـتارتیە هـەڕایان کردووە، بەگورجی چووم خۆم گەیاندە کۆشکی زەدیج دیم وا سوپای شـا، هـەر چـوار دەورەی کۆشکی داوە و خەریکن دەیسووتێنن و فەرمانی لە سێدارەدانی زەدیجیان پێ سپێردراوە. هەواڵم پرسی چی قەوماوە، وتیان: (ئەسـتارتیە مـردووە، هەنـدێکی تـر دەیانووت نەخێر نەمردووە، دەرباز بووە هەندێکی تر وتیان لە بەندیخانەیە، هەر جـۆر بوویێ بۆم دەرکەوت بایی پەنیرەکەم چوو، دوای ئەوە چووم بۆ لای سالار (ئۆرکان) کە خۆم و ژنەکەم لەو کارەساتە بپارێزێ، چونکە ئەویش زۆر حەزی لە پەنیرەکەم دەکـرد، پەنای ژنەکەمی دا و خۆمی دەرکـرد، ئـەوەش لەبـەر ئـەوەبوو چـونکە ژنەکـەم لـە پەنیرەکەم سپی تر بوو بە هۆی کلۆڵیم، کولمی سوور و لێوی ئاڵی ژنەکەم لە سێوی لا سوور و ناسکی ئەرخەوانی شاری (سوور) جوان و ناسکتر بوو، جارێکیـان نامەیـەکی پڕ بە سۆز و گریانم بۆ نارد، بەوکەسەی کە نامەکەی بۆ برد وتبووی من ئەو کابرایـە ناناسم، سامەگەر لەدەمی خەلکەوە ناویم بیستبێ، وتبووی بیستوومە پـەنیری سـپی چاك دروست دەکات، ئەگەر پەنیری بۆ هێناوین پارەکەی بدەینێ و بەرێی کەن).

کە کوێرەوەری تەنگی پێ هەڵچنیم ویستم پەنا بەرمە بەردادگا بەڵکو بەهانامەوە بێت، هیچم بە دەستەوە نەما ئـەوەی هـەبوو تـەنیا شـەش میـسقاڵ زێـر بـوو، دوو

میسقالم دا بەو دادوەرەی کە راوێژکارم بوو، دوو بەو کەسەی کە بوو بە بریکارم و پرسەکەمی گەیاندە دادگا، دوانەکە مابوون دامن بە نەمینداری سەرۆکی دادگای یەکەم، پارەکانم هەموو دابەشبوون کە هێشتا کێشەکەم لەدادگا لە شوێن خۆیایەتی نەجوولاوە، لەنرخی پەنیر و ژنەکەم پارەی زۆرترم خەرج کرد و سوودی نەبوو، کەزانیم هیچم پێ ناکرێ بەرەو گوندەکەی خۆم گەڕامەوە بۆ ئەوەی خانووەکەم بفرۆشم تا ژنەکەم بگێرمەوە.

خانووەکەم بایی شەست میسقالێ زێر بوو، خەڵك کە زانییان من دەسەپاچە بووم و پێویستیم بە پارەیە، یەکەم جار سێ میسقاڵیان دامێ، وردە وردە بوو بە بیست میسقاڵ، لە دوایدا بوو بەدە، لەبەر ئەوەی سووتاوی مەبەستی خۆم بووم بەو نرخە فرۆشتم، بۆ بەختە رەشەکەی خۆم لەپڕ سالاری (ئەرکانیا) پەلاماری بابلی دا ئەوەی کەوتە بەر رێگەی وێرانی کرد، خانووەکەی منیش بەر تالانی کەوت و ئاگری تێبەردا و سووتاندی، ئەوەی هەمبوو ماڵ و ژن و خانوو بوو هەمووی فەوتا، هاتمە ئەم شوێنە کە دەمبینی، وائێستا دەمەوێ بە راوە ماسی خۆم بژێنم، کەچی ماسیش وەکو مرۆڤی ئەم رووی جیهانە گاڵتەم پێ دەکات، ئەوەتا دەبینی یەك ماسی ناکەوێتە ناو تۆرەکەمەوە، وا برسییەتی خەریکە زیفم پێ بکات، ئەگەر تۆ نەبوایت ئێستا نوقمی ناو ئەو ئاوە ببووم، توخوا لێم گەڕێ با خۆم لەم ژیانە تاڵە رزگار بکەم، کابرای راوچی چیرۆکی بەسەر هاتەکانی خۆی لەسەریەك تیلمە نەدەگێرایەوە، چونکە زەدیجی دەروون پڕ لەخەم جاروبار وتەکەی لەدەم دەبڕی و دەیووت: ((ئەی دوای ئەوە.. ئەی شتێ لەبارەی شاژنەوە نازانی ؟)).

ئەویش وەلامی دەدایەوە: ((گەورەم ئەوەی دەیزانم زەدیج و شاژن، پارەی پەنیرەکەیان لاماوە و نەیاندامێ، ژنەکەشم لێ داگیرکرا، بەو جۆرە گەیشتمە ئەم حاڵەی کە تیایدام)).

زەدیج وتی: (وای بۆ دەچم تۆ هەموو سامانەکەت لە دەست دەرناچێ، خەڵك باسی ئەو پیاوە شەریفەیان دەکرد کە دەگەڕێتەوە بۆ بابل، ئومێدە وابێ، کە گەڕایەوە

ئەوەی لە سەریەتی بە زیادەوە دەیداتەوە، بەلاّم ژنەکەت کە ئەوەندە بیّ ئەمەك و بیّ وەفابوو، وا پەسەندە لیّی گەریّ و لەشویّن ئەودا ژنیّکی تر بیّنی، بڕوام پیّ بکە، هەرئیّستا بەرەو بابل بگەڕیّرەوە، من بەر لە تۆ دەگەڕیّمەوە من سوارەم وەلّی تۆ پیادەی، کە گەیشتینە ناو شار یەکسەر برۆ بۆ مالّی (کادۆر) و پیّی بلّیّ کە تۆ لەڕیّگەی هاتنەوەتدا برادەرەکەی ئەوت دیوە و لای ئەو چاوەڕوانم بە، بڕۆ ئومیّدە ئەمە کۆتایی کلّۆلّیت بیّ. زەدیج دەستی کرد بە نزاکردن و وتی: (ئەی ئەهرۆمەزدای گەورە و بە توانا منت بۆ دلّدانەوەی ئەم کابرایە گەیاندە ئەم شویّنە، داخۆ کیّت ئامادەکردبیّ بۆمن ئەوەی دلّم بداتەوە؟ وای وت و ئەو پارانەی کە لە ولاّتی عەرەباندا دەستی کەوتبوو نیوەی دا بەو پیاوە، کابرای راوچی کە ئەوەی دی لە خۆشیاندا شاگەشکە بوو، ویستی هەردوو پیّی زەدیج ماچ بکات و وتی: ((هەبیّ و نەبیّ تۆ فریشتەی فریاکەوتنی)).

بەلاّم زەدیج بەتاسەوەی هەوالّیّك بوو، چاوی بۆ فرمیّسك رشتن ئامادەبوون کابرای راوچی پیّی وت: ((گەورەم ئەوە بۆ وا خەمباری، پیاوی بەخشندە و میهرەبان چۆن کلّۆلّی دەبیّت)). زەدیج وتی: ((من سەد ئەوەندەی تۆ کلّۆلّم)) راوچییەکە وتی: ((چۆن وایە، ئایا دەبیّ یەکیّك دەهەندە بیّ سەد ئەوەندەی دەرۆزەیەك کلّۆلّ بیّ ؟)).

زەدیج وتی: ((سەرچاوەی کلّۆلّی تۆ پیّویستی ژیانە، بەلاّم سەرچاوەی کلّۆلّی من دلّە)).

راوچییەکە وتی: (ناشیّ نۆرکان ژنەکەی تووشی داگیرکردبیّ)) ئەم وتەی راوچییە سەرلەبەری ئەهامەتییەکانی زەدیج لە سەگەکەی شاژنەوە تا دەگاتە کۆشکەکەی ئاربۆجاد بەیاد هیّنایەوە. زەدیج بە راوچییەکەی وت: ((یەکیّکی وەکو نۆرکان دەبیّ بەسزای خۆی بگات، کەچی ئەریت وای بریوەتەوە ئەو و، ئەوانەی کە وەك ئەون بە بەختەوەر دەناسریّن، هەرجۆر بووە ئیّستا بەرەو بابل برۆ کە گەیشتیتە ناو شار یەکسەر برۆ بۆ مالّی کادۆر لەویّ چاوەڕوانم بە)) لەویّدا جیابوونەوە، راوچییەکە سوپاسی بەختی خۆی دەکرد، زەدیجیش سەد نەفرەتی بۆ بەختی خۆی دەنارد.

* * *

## باسلیك

زەدیج رێی بەرەو بابل تەی دەكرد، گەیشتە شوێنێك هەمووی مێرگ و چیمەن بوو، دی لەناو مێرگەكەدا چەند ئافرەتێك بەریان بە چیمەنەكە گرتووە و بە وردی لە گیایی ناو مێرگەكە ورد دەبنەوە و دەیدۆزن، لە یەكێكیان نزیك بووە و پرسی: كەستان ناوێ یارمەتی دۆزینەوەی ئەو شتەتان بدات كە بۆی دەگەڕێن؟. یەكێكیان سووری بو هاتە دەم و وتی: كاكی ڕێبوار، بەڕێگەی خۆتا بڕۆ ئەوەی ئێمە بۆی دەگەڕێین بۆ پیاوان نەهاتووە بە هیچ جۆر دەستی لێ بدەن.

زەدیج وتی: ((شتێكی سەیرە، ئایا بۆم هەیە بپرسم ئەو شتە چییە جگە لە ژنان بۆ كەسی تر نەهاتووە دەستی پێوە بدات؟!)) ژنەكە وتی:

(ئەوە پێی دەڵێن باسلیك)). زەدیج وتی: ((باسلیك، باسلیكتان بۆ چییە؟ بەكاری چی دێ ؟)) ژنە سوورییەكە وتی: ((ئێمە هەموومان كەنیزەكی خاوەنی ئەو كۆشكەین كە لەوپەڕی ئەو مێرگەوە دیارە، كەناوی (ئۆگۆڵە) ماوەیەكە تووشی نەخۆشی بووە، پزیشك بووی نواندووە كە ئەگەر باسلیك لەگەڵ گوڵاودا بیكولێنێ و بیخوات لە نەخۆشییەكەی رزگار دەبێ، ئەو باسلیكە گیانلەبەرێكی تۆكمەیە تەنیا بۆ ژنان خۆی بە دەستەوە دەدات، گەورە و سەروەرمان ئۆگول پەیمانی داوینەتێ كەهەر كامێكمان باسلیكی بۆ بگرین مارەمان بكات، لێم گەڕێ با بۆ خۆم هەوڵ بدەم، ئەگەر یەكی لەو ژنانە دەستی بكەوێ من قوڕ بەسەر و داماو دەبم)).

زەدیج لەو ژنە سوورییە و ئەوانیتر دوور كەوتەوە، بەناو چیمەن و مێرگەكەدا دەسوورایەوە تاگەیشتە ئەو پەڕی مێرگەكە، لە كەناری جۆگەیەكدا ئافرەتێكی داماو و بەسەزمانی دی لەسەر لاتەنیشتی ڕاكشابوو، بەژن و باڵا جوان بوو، لەچەكی بەسەر روومەتیدا دابوو، وەكو ژنەكانی دیكە بەشوێن باسلیكدا نەدەگەڕا، هەناسەی ساردی هەڵ دەكێشا، چاوی لە جۆگەكەی تەنیشتی بڕیبوو، بە چیلكەیەك شتی لەسەر لمەكەی

تەنیشتی دەنووسی، زەدیج بە پارێزەوە لێی نزیك بووەوە، ئارەزوو پاڵی پێوە نا بزانێ ئەو ژنە بۆ بەو کەساسییە لەوێدا کەوتووە و چی لە سەر ئەو لمە نەرمە دەنووسێ، کە تۆزێکی تر لێی نزیك بووەوە دی بە چیلکەکەی دەستی پیتی (ز) نووسراوە بە دوایدا پیتی (ە) هاتووە، تۆزێکیتر ورد بووەوە، دی پیتی (د، ی، ج) بە شوێن یەکدا نووسراون، کە دوو پیتەکەی دوای خوێندەوە تەزوێك لەسەریەوە بروسکەی دا و لەبن پێیەوە دەرچوو، حەپەسا، بڕوا مەکە سەرسامی و حەپەسانی وا تا ئەو ساتە بەسەرکەسی دیکەدا هاتبێ، لە شوێن خۆیدا وشك راما، زمانی بەسترا، جووڵەی پێ نەکرا، دوای ساتێ پەتی بێدەنگی پچران، بە زمانێکی لەنگ و شەرماویەوە هاتە دەنگ و وتی: ((ئەی خانمی گەورە و میهرەبان لە ئاوارەیەکی نائومێد ببوورە ئەگەر پرسیارت لێ بکات، ئای ئەوە چ رێکەوتێکی سەرسوورهێنەرە بۆی کە ببینێ ناوی زەدیج لەوێدا نووسرابێ)).

ئەو دەنگە و ئەو ئاخاوتنە کەبەرگوێی خانمەکە کەوتن، بەدەستێکی لەرزۆکەوە پەرچەمەکەی لەسەر رووی خۆی لادا و روانییە زەدیج، کەدی ئەوە زەدیجە هاوارێکی پڕ لە سەرسوورمان و سۆز و نیانی لێ بەرز بووەوە، سۆزە کپبووەوەکانی ناو دەروونی لەپڕ هرووژمیان بردە سەر هۆشی و نزیکی شایی مەرگیان کردەوە و بە بێهۆشی لەبەردەم زەدیجدا کەوت، ئەم خانمە ئەستارتییە، شاژنی بابل بوو !: ئەمە ئەو (ئەستارتیە) یە کە زەدیج دەیپەرست، ئەمە ئەو خانمەیە زەدیج زۆری بۆ گریا، فرمێسکی زۆری بۆ رشت، ئەمە ئەو شاژنەیە کە دەترسا نەمابێ، یان تووشی رووداوی ناهەموار بووبێ، زەدیج چەند تاوێك لە حەپەساندا ماوەیەوە، نەیدەزانی چی بکات، چی بڵێ، تاوێ سەرنجی چاوەکانی ئەستارتیەی دا کە بە ئاستەم و شەرم دەکرانەوە، ئا لەو ساتەدا زەدیج هانای بەرزکردەوەو وتی:

(هۆ توانای ئەمر، هۆ ئەوەی کە چارەنووسی خەڵکت لەبەر دەستدایە، ئایا پێت دەکرێ ئەستارتیەم بۆ بگێڕیتەوە دۆخی جاران؟ کەی؟ لەکوێ؟ لەکام جوانیدا پێی شاد دەبمەوە؟)). ئەوەی وت و لەبەردەم ئەستارتیەدا بە چۆکا هات و تەوێڵی لە خۆڵەکەی

بەر پێی دەخشاند. شاژن بە نیانییەکەوە بەرزی کردەوە و لە تەنیشت خۆی لە گوێی جۆگەکە دانیشتن، بە دەستە نەرمەکانی پەیتا پەیتا فرمێسکەکانی دەسڕینەوە، هەنسکی خۆشی ئەو ژوانە چاوەڕوان نەکراوە لە گەرویدا تاسابوون، لە چاوەکانیەوە دەرژانە خوارێ، چەندان جار ویستی قسە بکات لەمە دەمی دەکردە هەنسکەکان دەرفەتیان نەدەدا، دەیویست پرسیار لەو رێکەوتە بکات کە لەوێدا بە یەکی شاد کردنەوە، کە دەستی بەگێرانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆی دەکرد، وتەکانی خۆی دەبری و پرسیاری لە زەدیج دەکرد بۆ ئەوەی دەردەسەرییەکانی ئەو بزانێ، لە دواییدا توانییان خۆیان هێور بکەنەوە و بە ئاسانی بە یەکەوە قسە بکەن، زەدیج بە کورتی و رەوانی توانی ئەوەی بەسەریدا هاتبوو بیگێڕێتەوە، لە پاشدا وتی:

((ئەی ئازیزەکەم ئەوە چ رێکەوتێکی تۆکمە بوو وا من و تۆی لەم شوێنە لا تەریکەدا بەیەك شاد کردەوە؟. ئەوەتا تۆ بەرگی کەنیزەکیت لەبەردایە، لەگەڵ چەند ئافرەتێکدای بۆ باسلیك دەگەڕێن بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاوی گۆڵدا بیکولێنن و نەخۆشی سەردارەکەیان پێی چاك بکەنەوە)).

ئەستارتیە بە نەزاکەتەوە وتی: ((لێیان گەرێ با بۆ باسلیك بگەڕێن.. با هەموو بەسەرهاتەکانی خۆمت بۆ بگێرمەوە، دیارە چارەنووس وای ویستووە ئەو هەموو دەردەسەرییەم بەسەردا بینێ، من تەنیا ئەوە ئاواتم بوو جارێکیتر بە دیداری تۆ شاد ببمەوە، وا ئاواتەکەم هاتە دی، ئیدی لە هیچ باکم نییە، ئەوەی بەسەر مندا هات یاخوا بەسەر کەسدا نەیێ، کە شای مێردم وای لێ هات خۆشەویستی خۆی لەدەست بدات، فەرمانی دا، تۆ لە سێدارە بدات و من ژەهر خوارد بکات،، خوا و راسا پیاوە کورتیلەکەم ئەو نیازەی شای پێڕاگەیاندم، برادەرە ئازیزەکەت (کادۆر) بەگوێ کردم، زوو هەواڵەکەی بۆ هێنای کە زوو بەرەو بابل بڕویت و خۆت دەرباز بکەیت، دوای ئەوەی کە تۆی دەربازکرد، لە دەرگایەکی نهێنییەوە هاتە لام و منیشی دەربازکرد، گەیاندمییە پەرستگای (ئەهرۆمەزدا) کە براکەی خۆی مۆغیەتی، لەناو پەیکەرە گەورەکەدا منی شاردەوە، هەرچیم پێویست بوایە بۆی دابین دەکردم، بیستم بەیانی

ئەو رۆژە پزیشکی شا دەچێتە ژوورەکەم، ژەهرێکی وەهای پێ دەبێ کە بە یەك قوم هەموو هەناوم دا فەرەقێنێ، جەلادێکیش بە خۆی و پەتێکی شینی خنکاندن و چەند کەسێك روو دەکەنە کۆشکەکەی تۆ، کە دەبینن هەردووکمان لەوێ نین سەریان سوور دەمێنێ، (کادۆر) بۆ ئەوەی شا گومڕا بکات، چوو بوو لای پێی وتبوو گوایا تۆ بەرەو هیندستان و من بەرەو میسر رامان کردووە، ئەوەندە هەبوو ئەوانەی بۆ گرتنی من بەرەو میسر رۆیشتبوون منیان نەدیبوو تا بمناسن، ئەوانە هەر بە شێوە و تاریف بە شوێن مندا گەڕابوون، رێکەوت وا دەبێ لە سنووری میسردا تووشی ژنێ دەبن کە لە بەژن و بالاّدا وەك من دەبێ، لام وایە لە جوانیشدا لەمن جوانتر دەبێ، پیاوەکان دەیگرن گومانیان لەوەدا نابێ کە ئەو ژنە ئەستارتیەیە، دەیگرن و دەیبەنە بەردەم مۆبەدار کە چاوی پێی دەکەوێ پیاوەکان بە هەڵە دەخات و تووڕە دەبێ بەلاّم کە لە ژنەکە ورد دەبێتەوە تووڕەییەکەی دەنیشێتەوە و دێتەوە سەرخۆی، ئەو ژنە ناوی (مەیسووف) دەبێ، مانای ناوەکەی لای میسرییان (جوان تووشکە)یە بەراستی تووشکە دەبێ، چەند چەتوون دەبێ ئەوەندەش لێزان و کارامە دەبێ، مۆبەداری خۆش دەوێ و دەتوانێ بەسەریدا زاڵ بێ، وا دەکات مۆبەدار بە فەرمی بیکات بە ژنی خۆی و ببێ بە شاژن، وای لێ دێ پەردە لەسەر تووشی و سەرکەشی خۆی لابداتەوە و، ئەوەی بیەوێ بەبێ ترس و بێم بیکات، بۆ نموونە داوای لە گەورەی مۆغەکان کردبوو کە لە بەردەمیدا سەما و سووڕدانی بۆ بکات، کابرای موغە کەنفت و بە تەمەنا چوو دەبێ، داوای لێ دەکات کەلێی ببووری چونکە توانای سەمای تیا نەمابوو، لەو کاتەوە رکی لێی دەبێتەوە و بەخراپترین جۆری چەوساندنەوە دەیچەوسێنێتەوە، هەروەها فەرمان بەسەر سەرداری مەیتەرەکاندا دەدا کە کێکێکی حەلوایی بۆ دروست بکات ئەویش وتبووی ئەوە کاری من نییە و لەو جۆرە ئیشانەدا سەرم دەرناچێ، بەلاّم ئەو لەسەرکردنی مکوڕ دەبێ، بەهەر حاڵ کە کێکەکەی بۆ دەکات لە جیاتی پاداشت سزایەکی توندی دەدات، چونکە قەراخێکی کێکەکە تۆزێ دەسووتێ، پیاوە کورتیلەکەی بەردەستی لە جیاتی ئەو دەکاتە سەرداری مەیتەرەکان، بەوەش

راوەنەستابوو کاروباری سیاسی دەوڵەتی دابووە دەست یەکێك لە خزمەتکارەکانی کۆشك، تا بەو جۆرە حوکمڕانی وڵات بەڕێوە دەچوو، بۆیە خەڵکی بابل بەداخ و تاسەوە یادی منیان دەکردەوە.

شا تا بڵێی پیاوێکی راستڕەو و دەروون پاك بوو، بەڵام کە فەرمانی کوشتنی ئێمەی دەرکرد و ئەو ژنە میسرییەی کرد بە هاوسەری خۆی، هەموو چاکە و پیاوەتییەکەی دا بەدەم لێشاوی خۆشەویستی ئەو ژنە تووشە جوانەوە.

کە رۆژی جەژنی پیرۆزهات (مۆبەدار) هات بۆ پەرستگەی (ئەهرۆمەزدا) لەسەر لەپی روو لەبەردەم ئەو پەیکەرە دا، کە خۆم تیایدا حەشاردابوو، خۆی دا بە زەویدا و دەپارایەوە کە خواکان یارمەتی مەسیووف بدەن، منیش لەناو پەیکەرەکە دەنگم بەرزکردەوە و وتم: (خواکان گوێ لە پاشایەکی گومڕا ناگرن کە ژنێکی ژیر و وریا بکوژێ و یەکێکی بێهۆش و نەفام بخاتە شوێنەکەی).

مۆبەدارکە گوێی لەو دەنگە بوو ـ لەخۆ چوو و هۆشی لای خۆی نەما، چەند رۆژێکی پێ نەچوو مێشکی لای خۆی نامێنێ، چۆن وای لێ نایەت، ئەو سروشەی کە لەبارەی گومڕایی خۆی و شێتی مەیسووفەوە خستمە ناو دڵییەوە دەبوو شێتی بکەن و هۆشی تێك بدەن، لە دواییدا بە تەواوی شێت دەبێ. کە خەڵك زانییان شا شێت بووە، هەموو لایان ئاشکرابوو کە ئاسمان تۆڵەی منی لێ کردووتەوە، هەر لەو کاتەوە نیشانەی یاغی بوونی خەڵك لە هەموو لاوە دەستی پێکرد، وڵاتی بابل بوو بە شوێنی ئاژاوە و کوشتن و بڕین و تالانکردن، جەردە و دز و درۆزن لە هەموو لایەکەوە سەریان هەڵدا، بەتاڵی و بێکاری هەموولایەکی گرتەوە و بابل بوو بە مەیدانی چەتە و هۆز و گرووپە جۆراوجۆرەکان، ئەوەندەی پێ نەچوو یەکێك لە گرووپەکان منیان لەناو پەیکەرەکەدا دەرهێنا و خستمیانە سەرشانی خۆیان، کادۆری دڵسۆز بۆ میسر بە شوێنتا هات بۆ ئەوەی بەرەو بابل بگەڕێتەوە، سالاری ئۆرکانیا کە زانی وڵاتی بابل بووە بە شوێنی ئاژاوە و کەس لەکەس نییە، پارتێکی لەوڵاتی کلدانیادا پێکهێنا و هێرشی کردە سەر لەشکری شا، مۆبەدار بەخۆی و لەشکرییەوە رووبەڕووی بووە وە،

مۆبەدار بە بریندارى مرد، ژنە چەتوونە تووشەکەشى لەگـەڵ مۆبـەدار بـوو، ئـەویش کەوتە ژێر سمى وڵاغەکانى لەشکرى کلدانییان و یەخسیر کرا، چارەڕەشى وڵاتى بابلى گرتەوە، منیش لەشکرى نۆرکانیـا بـەدیلیان گـرتم و بۆبێبەختییەکـەى خـۆم لەگـەڵ مەیسووفدا باڵ بەست کراین و براینە بەردەم سەر لەشکر سالارى نۆرکانیا. کـە ئـەو سالارە هەردووکمانى دى زانى من لە مەیسووف جوانترم، رەنگە پێت خۆش نەبێ ئەو راستییە بڵێم منى لەریزى ژنەکانیدا دانـا، پـەیمانى دامـێ کـە نـزیکم نەکـەوێ تـا پەلامارى شوێنێ کە خۆى دەیزانێ نەدا و نەگەڕێتەوە، گەلێ هەسـتى بەلێقـەوماویم دەکرد، هەرجۆر بوو هیچ پەیوەندییەك لە نێوان من و مۆبەداردا نـەما، بـەوە زانـیم بەرەو زەدیج نزیك دەبمەوە.

بەسەر ئەو هەموو ناز و گـەورەیی و پایـە بـەرزیا چـارەنووس خـستمیە داوێنـى پیاوێکى نەزان و درندە لەگەڵ ئەو هەموو پایە و سایەمدا رکم لێ ى نەدەبووەوە، لـە پێشینانەوە بیستوومە (ئاسمان ئەگەر پایە و سایەى بە یەکى بەخشى، ئەگـەر پێـى رازى نەبێ دەیبڕێ و ئەو کەسە دەکەوێتە خوارەوە) منیش لافى جارانم لێ دەدا کەچى سەرنج دەدەم بەچاوى کارەکەرێك تەماشام دەکەن، کابراى نۆرکانى هەر ئاوریشى لێم نەدەدایەوە، گوێم لێ بوو بە پیاوە رەشە خەساوەکەى خۆى دەووت:

(ژنێکى خراپ و بێشەرمە بەلاّم تۆزێ جوانە) لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانى دابوو کـە بەرێزەوە تـەماشام بکرێ، لەخـەو و خۆراکیـشدا بـایخم پێبـدرێ بـۆ ئـەوەى رەنـگ و رووخسارم بگەشێتەوە و بەکارى ئەوە بێم بۆى بچمە پـەردەوە و پایـەم بەرزبکاتـەوە! ئاگادارم کردووە کە دەمەوێت خۆم بکوژم، ئەویش بەتەسەوە وتى (کەس بـە دەسـتى خۆى، خۆى ناکوژێت، ئەو پەى بەوە بردبوو من شتى واناکەم بەلاّم مەبەسـتێکى تـرم هەیە، لێم دوور کەوتەوە، بـەلاّم وەکـو تووتییـەك بخەیتـە نـاو باخـچەى ئاژەلانـەوە خستمیە ریزى ژەنەکانییەوە، ئاى شاژنى بابـل تووشـى چ چارەڕەشـى ولێقـەوماویێ بووى، ئاى ئەو دڵەى کە گیرۆدەى ئەڤینى زەدیج بوو چیت بەسەرهات).

که ئەستارتیە وتەکانی تەواوکرد زەدیج بە سەر چۆکیدا کەوت، هەردوو ئەژنۆی ئەستارتیەی بە فرمێسکەکانی تەرکرد. ئەستارتیە بە سۆزەوە سەری پێ بەرزکردەوە و لەسەر چیرۆکی بەسەرهاتەکانی روویی و وتی: (بیرم لە چارەڕەشی خۆم دەکردەوە، چۆن ببووم بە یەخسیری زەلامێکی دڕندە و هار، کرابووم بە هاودەمی ژنێکی چەقەباز و تووش، دوژمنم بوو، ئەویش وەکو من لێ قەوماو و دیل بوو، رۆژێکیان بەیەکەوە دانیشتبووین، بەسەرهاتی خۆی لە میسر بۆی گێرامەوە، لە نیشانە و خەسڵەتی ئەو کەسە مەردەدا کە لە چنگ زەلامێك ویستبووی بیکوژێ رزگاری کردووە ئەو کەسەم بە زەدیج وێناکرد، گومان لەوەدا نەبوو کە تۆ ئەو کات چوو بووی لە (مەمفیس) بژی. منیش ویستم پەنا بەرمە بەر (مەمفیس) بە مەیسوونم وت: (ئەی جوان مەیسووف، تۆ گەڵێ لەمن گەش و جوانتری، لەمنیش بەتوانا و یارای، دەتوانی ئەمیر (ئۆرکان)م بۆ تەفرە بدەی تا دەرفەت وەربگرم را بکەم، ئەوکات دەتوانی بە ئارەزووی خۆت بەسەر ئەمیردا زاڵ ببی، لە هەمان کاتیشدا بە راکردنی من لە دژێك رزگار ببێ) مەیسووف ریگەی راکردنی بۆ ئاسان کردم، رۆژێك لەگەڵ خزمەتکارێکی میسریدا خۆم دەرباز کرد و بۆی دەرچووم، رێگەمان گرتە بەر تا نزیکی وڵاتی عەرەبان بووینەوە، بۆ بەختی من رێگرێك کە ناوی ئاربۆجاد بوو رێگەی پێ گرتین و منی رفاند و فرۆشتمی بە بازرگانێك، بازرگانەکەش منی گەیاندە ئەو کۆشکە کە دیارە، خاوەنەکەی ناوی (ئۆگۆڵە) ئەو منی کری بەبێ ئەوەی بزانێ من کێم، ئەو پیاوە جگە لە خواردن و خواردنەوە شتێکی تری لا مەبەست نییە، وا دەزانێ تەنیا بۆ ئەوە دروستکراوە تاسکی پڕ بکات.

وادەزانێ خوا بۆ ئەوەی دروستکردووە لەسەرخوان دانیشێ، لە زۆر خواردندا بووەتە زەلامێکی تێکسمڕیاو، سەروبنی بووە بە یەك، لە قەڵەوی خۆیدا بە گران هەناسە دەدات، کە دەخوات بە هەردوو دەستی بەدەم خۆیدا دەکات، پزیشکەکەی لای وایە ئەو هەموو خواردنانە کە قوتیان دەدات دەتوانێ هەرسییان بکات مەترسییان لەسەر تەندروستی نییە، ئەو کابرایە، پزیشکەکەی وای خستووە

مێشکیەوە ئەگەر باسلیکی کولاّو بە ئاوی گوڵ بخوات ئەو دەغزەی لە کۆڵ دەبێتەوە، ئەو (ئۆگۆڵ)ە پەیمانی بە ژنە یەخسیرەکانی داوە: ئەوەیان باسلێکی بۆ بدۆزێتەوە لە خۆی مارەی دەکات، ئەوەتا دەبینی من تێکەلاّویان نەبووم و نەمویستووە بەو پایە بگەم کە ئەوان ئومێدیانە پێی بگەن، چەند لەم شوێنەدا بە شوێن تۆدا گەڕاوم هەر ئەوەندەش بەشوێن باسلیکدا گەڕاوم، ئەی خوای گەورە چەند ستایشت بکەم هەرکەمە، چونکە لەم شوێنەدا ئەم شادبوونەوەت پێ بەخشیم).

ئەو دوو دڵدارە، ئەو دوو عاشقە گڕی ئەو سۆزەی کە دەروونی برژاندبوون، چەند دەرەفەتیان نەبوو بۆ یەکتری دەری برن، لەو شوێنەدا بە جوانترین و گەرمترین شێوەی دەربڕین، هەریەك گەنجینەی ئەڤینی خۆی بۆ ئەویتر دەربڕی، ئەو فریشتانە کە کاریان بەرزکردنەوەی سۆزی دڵدارانە، هەست و سۆزی بێگەردی ئەو دوو دڵدارەی گەیاندە فەلەکی ناهید.

ژنەکان بە نائومێدی و دەست بە تاڵی بەرەو کۆشکەکە گەڕانەوە و هیچ کامێکیان بە ئەمیری کۆشك شاد نەبوون، زەدیج بەرەو کۆشکەکە چوو، خۆی گەیاندە دیوان و لەبەردەم ئۆگۆڵدا راوەستا و وتی: (خوا لەو ئازارە رزگارتان بکات تابە ژیانێکی بەختیاری و کامەرانی بژیت، گەورەم من پزیشکم بیستوومە خاوەن شکۆتان نەخۆشە، من هاتووم باسلیکم بۆ هێناوی، بۆئەوەی کە گەورەم نۆشی کرد لەو نەخۆشییە رزگار ببێ، من لە پاداشتدا داوای خەلاّت ناکەم بەڵکو لە جیاتیدا لە گەورەم یەك خواستم هەیە بۆم جێبەجێ بکات، خواستەکەم ئەوەیە چەند رۆژێك لەمەو بەر دیلێکی بابلی هاتووە ئێرە، گەورەم ئازادی بکات، من ئامادەم لە جیاتی ئەو ببم بە بەندەتان ئەگەر گەورەم لە نەخۆشییەکەی رزگار نەبوو)).

(ئۆگۆڵ) دەستبەجێ ئەوەی زەدیج وتی قەبووڵی کرد و ئەستارتییەی ئازاد کرد، دوای ئازاربوونی لەتەك کارەکەرێکدا بەرەو بابل گەڕایەوە، پەیمانی بە زەدیج دا لەمە گەیشتەوە بابل دەست بەجێ هەموو هەواڵێکی بۆ بنێرێ، بە چ جۆر بەیەك شادبوونەوە بەهەمان جۆر لەیەك جیا بوونەوە لە کتێبی پیرۆزی (زەند ئاوێستا) دا

هاتووه (کاتی بەیەك گەیشتن و لەیەك دابڕان گرنگترین کـاتی ژیـانن). خۆشەویـستی ئەستارتیە لەدڵ زەدیجدا گەڵێ لەوە مەزنتربوو کـە بـۆی دەری دەبـڕی، ئەسـتارتیەش گەڵێ بۆ زەدیج سووتاوتر بوو تا ئەوەی کە لە نـاوەوە دەکـولا و بـە فرمێـسك دەری دەبڕی، زەدیج بە ئۆگۆڵی وت: (گەورەم ئەو باسـلیکەی کـە بۆتـۆم هێنـاوە وە نـەبێ بخورێ بەڵکو بە ڕێگەی هەندێ کونی وردی نادیارەوە دەچنە ناو لەشەوە، خستوومەتە ناو کوندەیەکی ئاوساوی فووداراوەوە، دەبێ بە هەموو هێزێکتەوە پاڵێـدەی بـۆ مـن منیش بە توندی بۆتی دەگێڕمەوە، واتە توند بۆ لای من لێی دە، منـیش تونـد بـۆ لای تۆ لێی دەدەمەوە، ئەگەر چەند ڕۆژێ وا بکەی چاوت بە لەشی خـۆت و هونـەری من دەکەوێ).

لە ڕۆژی یەکەمدا بەنارەحەتی هەناسەی دەدا لە ماندوو بوونـدا لـە هـۆش خـۆی دەچوو، لە ڕۆژی دووەمدا هەستی کرد ئەو بارگرانییەی ڕۆژی یەکەمی کەمێ سـووك بووە، هەناسە سوارییەکەی کەمبووتەوە، لە ڕۆژی یەکەم خەوی باشتر پیـا دەکـەوت، هەشت ڕۆژی پێنەچوو هەموو هێز و سـووکی لـەش و گـورج و وریـایی جـارانی بـۆ گەڕایەوە، وەکو ئەو ڕۆژانەی جـارانی لێ هاتـەوە کـە بـە ڕۆژانـی بـەختیاری خـۆی دەیزانین. زەدیج کە زانی چاك بووتەوە پێی وت: ئەوە یاری فتبولێن بـوو تـۆ کـردت، گەورەم باسلیك لە سروشتدا دەس ناکەوێ، شتێکی خەیاڵییە، تەندروسـتی مـرۆڤ بـە خۆگرتن و قەناعەت و کۆشش و وەرزشە، زانینـی هونـەری تەندروسـتی کـارکردن و ڕانەوەستانە، ئەوەی وا دەزانێ تەندروستی و چڵێسی هونەرە، ئەوە خەیاڵـە و هونـەر نییە، وەکو بەردی فەیلەسووفان[٧] و کلوی ئەستێرەکان و جادوی کاهینەکانە.

پزیشکەکەی (ئۆگۆڵ) هەستی بەوەکرد کە زەدیج سەبارەت بەو بووە بە بڤەیـەکی گەورە و نانبڕی، بۆیە لەگەڵ دەرمانسازەکەی ناو کۆشکدا ڕێك کەوت کە زەدیج بەرەو

---

٧- بەردی فەیلەسووفەکان: ئەو بەردەیە کە فەیلەسووفەکان بەخەیاڵی دایان نابوو کە بەردێك هەیە لەهەر بەردێکی دیکە بخشینرێ دەبێتە زێڕ.

جیهانی نەمان رەوانە بکەن، لەوێ باسلیك بدۆزێتەوە ناوا لە جیاتی ئەوەی زەدیج خەلات بکرێ چونکە نەمیری کۆشکی لەو دەغەزەی هەیبوو رزگاری کرد، کەچی دەیانەوێ بیکوژن.

ناوا پیلانی کوشتنی بۆ دانرا: خولك کرا بۆ سەرخوانێکی رازاوە، بریار وابوو ژەمی دووەمی خوانەکە پڕ بکرێ لە ژەهری برشت و لە بەردەمی زەدیجدا دابنرێ، خوان رازاوە، بەشی زەدیج پڕکرا لە ژەهری کوشندە، بەلام بەرلەوەی بچێتە سەر خوانەکە، نامەیەکی لە نەستارتیەوە بە دەست گەیشت، لەمە درایە دەستی لەسەر هەردوو پێ هەلسا و خوانەکەی بەجێ هێشت و رۆیشت. سەبارەت بەو جۆرە هەلوێستانە زەردەشت پێغەمبەر فەرموویەتی (ئەوەی ژنی جوان بێ لە پیلان و تەنگوچەلەمەی ژیان رزگار دەبێ).

* * *

## زۆرانبازی

ئەستارتیە بەرەو شاری بابل گەڕایەوە، مەردوومی بابل بە هەمو چنێکیانەوە پێشوازییەکی گەرم و بە سۆز و پرتاسەیان کرد، لە بەرنەوەی ئەمیری ئۆرکانیا کوژرابوو تەماهی و ئاسایش باڵیان بە سەر بابلدا کێشابوو، بابلیەکان بریاران دابوو هەر کەسێکیان کرد بەشای بابل دەبێ ئەستارتیە مارە بکات، سوێند و پەیمانیشیان دابوو: ئەوەی دەبێ بەپاشا و مێردی ئەستارتیە دەبێ مەردێکی وەها بێ لەپایە و نموودا لە ئەستارتیە کەمتر نەبێ و نەهێڵێ جارێکی تر بابل ببێ بە شوێن پێلان گێڕان. دەشبێ لە پاڵەوانی و ئازایەتی و بلیمەتی و زانیندا وێنەی کەم بێ، تا جارێکی تر بابل تووشی تەنگ و چەڵەمە نەبێتەوە. لە دەرەوەی شاری بابلدا ستادێکی گەورەیان دروست کرد، دیوارەکەی بە بەردی مەڕمەڕ رازاندبوویانەوە، جگە لە دەرگای چوونە ژوورەوەی شا و شاژن و پیاو ماقوولان چەند دەرگای چوونە ژوورەوەی تری هەبوون لە ناوەوە وەکو پیلیکانە شوێنی بینەران دروستکرابوو، کە ئەوەی دادەنیشت بەرچاوی ئەوەی پاشەوەی نەگرێ، ئەوانەی کە زۆرانبازییان دەکرد، دەبوو بە پۆشاکی زۆرانبازی و پڕ چەکی پێویستەوە بچن، لە دەرەوەی مەیدانەکەدا، بۆ هەریەکێك لەوانە خانووێك دروستکرابوو، بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان کە ئامادە دەبن لەوێدا چاوەروان بن، نە کەس ببینن و نە کەسیش بیانبینێ، بەشداربووی ئەو زۆرانبازییە دەبوو لەو مەیدانەدا بە بەرچاوی خەڵکەوە چوارجار بەنێزەکەی چوار سوارەکە بکەوێنێ، هەر کامێکیان توانی هەموو دوژمنەکانی خۆی بکەوێنێ، ئەوە دەبێتە سواری یەکەمی سەرکەوتەی مەیدان و جەماوەر بریار لەسەر سەرکەوتنی دەدات، ئەوەی سەرکەوت دەبێ رۆژی پاش ئەو سەرکەوتنەی بە پۆشاکی زۆران بازییەکەیەوە بڕوا لەبەردەم کاهێنەکاندا راوەستێ و وەلامی پرسیار و مەتەلەکانیان بداتەوە، بۆ ئەوەی بزانرێ کە چۆن لە ئازایەتیدا بە یەکەم دەرچوو، وەهاش لە

حیکمەت و زانینیشدا بە یەکەم دەربچێ، ئەگەر مەتەڵەکانی پێ هەڵ نەهات نابێتە شا و ناچێتە سەر تەخت، لەو حاڵەتەدا دەبوو بەشداری زورانبازی و تاقیکردنەوەی زۆرانبازییەکە دووبارە بکاتەوە، چونکە بابلییەکان وایان دانابور ئەوەی دەبێتە پاشا یان دەبوو هەم ئازاترین و هەم حەکیم ترین کەس بێ.

لەماوەی هەڵبژاردنی پاشادا، بە توندی پاسەوان لەسەر ئەستارتیە دانرابوو، بۆ ئەوەی تا رۆژی زۆرانبازییەکە کەس نەبینێ و گفت بە یەکێك نەدا و یەکێك هەڵنەنێ و یەکێکی تر بێبەش بێ، لە رۆژی زۆرانبازی و تاقیکردنەوەشدا دەبوو پەرچەم بەسەر روومەتیدا بدات.

کە بڕیار لەسەر ئەوە درا، بەپەلە ئەستارتیە بۆ خۆشەویستەکەی زەدیج نووسی و جۆری تاقیکردنەوەکەی بۆ روونکردەوە و داوای لێ کرد فریا بکەوێ، ئازایەتی و زانایی خۆی وەها دەربخات کە کەسێکی دیکە نەگاتە ئاستی. رۆژێك بەر لە تاقیکردنەوەکە زەدیج گەیشتەوە رۆخی فورات، نیشانەکانی خۆی لە ناونیشانەکانی بەشدارانی زۆرانبازەکاندا تۆمارکرد، بە پێی قانوون دەم و چاوی خۆی داپۆشێ و ناوی خۆی ئاشکرا نەکرد، چووە ناو ئەو خانووەی کە بۆی تەرخانکرابوو، برادەرە خۆشەویستەکەی (کادۆر) دوای ئەوەی لە دۆزینەوەی لە میسر هەراسان دەبێ بۆ بابل گەڕابووەوە. بابلییەکان بەو تاقیکردنەوە دەیانویست یەکێکی وەکو زەدیج لە ئازایەتی و داناییدا بدۆزنەوە و بیکەن بە شای خۆیان و ئەستارتیەی لێ مارە بکەن، ئەستارتیە کە زانی زەدیج هاتووەتەوە و ناوی خۆی بۆ رۆژی زۆرانبازی تۆمار کردووە، ئەستارتیە بە دزییەوە تاسکڵاو قەڵغان و زرێپۆشێکی مەحکەم و ئەسپێکی ئێرانی رەسەن و چاپووکی بە هۆی (کادۆر)ەوە بۆ نارد، ئەویش بەهەر جۆر بوو ئەو شتانەی گەیاندە زەدیج.

زەدیج بەو خەڵات و دیارییانەدا ئەستارتیەی ناسییەوە، بەوناسینەوە ئەوەندەی تر نومێدی سەرکەوتن و بەخۆیدا پەرمین لە دەروونیدا جەم بوون، بەیانی کە تیشکی زێرینی رژاندە ناو شارەوە، خەڵك بەرەو ستادەکە روویان نا، شاژنیش لەژێر

سەیوانێکی رازاوەدا لە شوێنی تایبەتی خۆیدا دانیشت، هەروەها جەماوەری خەڵك بەژن و پیاوەوە لەهەموو چینێك گەیشتنە ئەوێ و لە شوێنی خۆیاندا دانیشتن، سوارە زۆرانبازەکان هاتنە ناو مەیدانەکەوە، ئەوەی کە دەهات دەچوو نیشانەکەی خۆی لەبەر پێی پیری کاهێنەکاندا دادەنا، ئەوجا دەویان[٨] بۆ کردن نیشانەکەی زەدیج دوا نیشانەبوو دەوی بەرکەوت، یەکەم کەس پیاوێ بوو ناوی (ئیتۆیاد) بوو، پیاوێکی دەوڵەمەند و لە خۆی رازی بوو، لە وریاییدا گێلە پیاو و بیر تەسك و بێئاوز بوو، نۆکەرەکانی هەڵیان خەڵەتاندبوو کە خۆی لەو بوگارە بدات، پێیان وتبوو تەنیا تۆ شایستەی تەختی بابلی، ئەویش لە بروای خۆیدا وتبووی: ((راستە پیاوێکی وەك من سەری بۆ چقەی شایی دروست کراوە)) لەبەر ئەوە لە تەپڵی سەریەوە تابن چۆکی زرێپۆش کردبوو، نیشانەکەی زرێکەی و نێزەکەی بە شریتی سەوز رازابووەوە، لەمە چووە مەیدانەوە بە هەڵسووڕانی ماینەکەیدا بۆ خەڵك دەرکەوت کە ئەوە ئەو پیاوە نییە چقەی شایی لەسەر بنرێ، کە یەکەم سوارە بۆی چووە مەیدانەوە توانی بیپەشۆکێنێ، کە دووەم بۆی چوو توانی بە ئاسانی لەسەر کلکی ماینەکەوە بیخاتە خوارەوە و لنگاو قوجی بکات. ئیتۆیاد توانی سوار بێتەوە بەلام بە جۆرێ چووەوە سەرزینی ماینەکەی کە هەموو بینەرانی هاوردە خەنین، کە سوارەی سێیەمیش بۆی چووە پێشەوە ئەوەندە خۆی بۆ ماندوو نەکرد نێزەکەی بۆ بەکاربێنێ، بەڵکو لە تەنیشتەوە تێپەری و لاقی راستی گرت و لەسەر ماینەکەی فرێی دایە خوارەوە، و ئەوانەی کە یارمەتی سوارەکانی ناو مەیدانیان دەدا بە پێکەنینەوە چوون خستیانەوە سەر پشتی ماینەکەی.

کە سوارەی چوارەمی بۆ چوو لاقی چەپی گرت و خستیە خوارەوە و لەناو لمی مەیدانەکەدا گەوزاندی. ئەوجا وەکو مردووێك لە مەیدانەکە برایە دەرەوە، بەپێی

---

٨- دەو وشەیەکی کۆنی کوردییە، مانای (القرعە)ی عەرەبییە.

یاسا برایەوە ئەو شوێنەی کەبەو تایبەت بوو بۆئەوەی ئەوشەوە لەوێ بحەوێتەوە، لەڕێی بردنەوەدا دڵی خۆی وا دەدایەوە کە دەیووت:

(ئوە چ ڕمبازییەکی سەخت بوو، جگە لەمن کێ بەرگەی دەگرێ !) سوارەکانی دیکەش هەریەك لە دەوری خۆیدا دەهاتنە مەیدانەوە، هەریەکێك چۆن پێویست بوو بە ئەرکی خۆی هەڵدەسا، هەبوو دوو سواری دەگلاند، هەشبوو دەگەیشتە سێ جگە لە ئەمیرێك کەناوی (ئۆتام) بوو کەس نەگەیشتە چوار، کە سەرە گەیشتە سەر زەدیج توانی بە شێوەیەکی سپۆرتانە چوار سوار ببەزێنێ، ماوە سەر ئەوە بزانرێ لە نێوان ئۆتام، زەدیج دا کێ سەرکەوتووی یەکەم دەبێ، زرێ و نیشانەکەی ئۆتام شین بوون، ئەوەکەی زەدیجیش سپی بوو، وائێستا ئومێدی سەرکەوتن لە نێوان سوارەی شین و سوارەی سپیدا دابەشە. دڵی شاژنیش لە لێداندایە، لە ئاسمان دەپاڕێتەوە کە ڕەنگی سپی سەربخات. ئەوجا لە نێوان ئەو دوانەدا پێکدادان بە شێوەیەکی ئاسایی و هونەری دەستی پێکرد، بە ڕێکوپێکی سەرە نێزەیان بۆ یەکتری ئاراستە دەکرد و هەردووکیان لەسەر زینەکانیان نەجمان، ئەوەندە بە جوان ڕکانبەریان دەکرد وای لێ هاتبوو خەڵکی بابل، جگە لە شاژن، حەزیان دەکرد هەردووکیان ببن بە پاشای بابل، هەردوو ماینەکان شەکەت بوون، هەردوو نێزەکان شکان لەوکاتەدا زەدیج فێڵێکی بۆهات: ماینەکەی خۆی لە دوای ماینەکەی ئۆتام تاوداو لەپڕ ڕاوەستاو بازی دایە سەرپشتی ماینەکەی و لە پشتەوە هەردوو دەستی بادا و خستیە خوارەوە، لەو کاتەدا لە هەموو لایەکی ستادەوە دەنگ بەرزبووە و ودیان وت: ((ئافەرین سەرکەوتن بۆ سواری سپی پۆشە)).

ئۆتام بەو جۆرە خۆی دییەوە تووڕە بوو، شیرەکەی هەڵکێشا و بۆ زەدیج چووە پێشەوە، ئەویش لە ماینەکەی دابەزی و شیرەکەی هەڵکێشا، ئەوەتان هەردووکیان ڕووبەڕووی یەکبوونەتەوە، جارێك توانا و هێز زاڵ دەبن جارێك گورجی و وریایی، ئەوەندە شیریان ئاراستەی سەری یەکتر کرد، چی پەڕەی تاسکڵاوەکانیان هەبوون بەدەم باوەچوون، چی مزماری قەڵغان و ئاڵقەی زرێکانیان هەبوون بە نووکەشیر پەڕین،

جارجار لەیەك ناڵنگارە دەبوون و جارجاریش جیا دەبوونەوە، وەکو دوو مار لەیەك دەناڵان، بروسکە و چەخماخەی بە یەکدانی شیرەکانیان دڵی هەموانی هێنابووە لەرزین، جارجار زەدیج تۆزێ دەوەستا و دەیویست فێڵێك بدۆزێتەوە، لەپر بە تەنیشت ئۆتام دا دەڕوا و دەیخاتە سەرزەوی، چەکی دەکات و لەسەر گازاری پشت دەیخات و رووتی دەکاتەوە و لەسەری رادەوەستێ، ئۆتام لەبەر دەستیدا هاوار دەکات و دەڵێ: (ئەی سوارەی سپی رەنگ تەنیا خۆت شایستەی تەختی بابلی).

شاژن ئەستارتیە لەو ساتەدا خەریك بوو لە خۆشیدا باڵ بگرێتەوە، بەپێی قانوونی رمبازی وڵاتی بابل هەردوو سوارە براوە بۆ ئەو خانووەی کە بۆ هەریەکێکیان تەرخان کرابوو، لەوێ زامەکانیان تیمار دەکرا و، کەڕوڵاڵەکان خزمەتیان دەکردن، بەدووری مەزانە ئەگەر بووترێ شاژن بە کەڕوڵاڵەکاندا خۆراکی بۆ زەدیج ناردبێ، دوای خواردن و حەواندنەوە لایان چۆڵ دەکرا بۆ ئەوەی ئەو شەوە بخەون و بەیانی هەریەك نیشانەی خۆی هەڵبگرێ و بچێتەوە ناو ستادەکە و نیشانەکەی لەبەردەم پیری کاهێنەکاندا بۆ تاقیکردنەوە و هەڵهێنانی مەتەڵەکان نامادەبێ، وتراوە کەسی عاشق کەم دەخەوێ هەرچەندە زەدیج عاشق بوو، بەڵام لەبەر زۆر ماندووبوون لەناو خەودا نوقم بوو، کەچی (ئیتۆباد) لە خانووەکەی زەدیجەوە نزیك بوو ئەو شەوە نەخەوت، لە نیوەشەو و گەرمەی خەودا چووە ناو خانووەکەی زەدیج، زرێ و نیشانە سپییەکەی دزی و زرێ و نیشانە سەوزەکەی لەشوێنیدا دانا. کە بەیانی خۆر گزنگی خۆی پەخش کرد (ئیتۆباد) بە خۆی و زرێ و نیشانەی سپییەوە خۆی گەیاندە لای پیری کاهێنان و تێی گەیاند کە ئەو سەرکەوتووە و ئەویش نیشانەکانی و نامادەیە لەبارەی زانینەوە تاقی بکرێتەوە، خەڵك لەو بڕوایەدا نەبوون کە ئەو سەرکەوتوو بووبێ، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتنی بەناو خەڵکدا جاردرا لە کاتێکدا کە هێشتا زەدیج خەو بەری نەدابوو، ئەو جاڕدانە ئەستارتیەی تووشی پەشۆکاندن و سەرسوڕمان کرد. بەیانی زەدیج کەلە خەو هەڵسا زۆر درەنگ بوو، نیوەی خەڵك ناو ستادەکەیان چۆڵ کردبوو، ئیتۆباد تاقیکرابووەوە، زەدیج بۆ ئەوەی لەشی خۆی داپۆشێ ناچاربوو بە زرێ و نیشانە

سەوزەکەی نیتۆبادەوە بچێتەوە مەیدانەکە و لەبەردەم پیری کاهێناندا بۆ تاقیکردنەوە راوەستێ، زەدیج بەو نیشانە سەوزەوە کە گەیشتە ناو مەیدانەکە ئەو خەڵکەی کە هێشتا لەوێ مابوون بەتانە و تەشەر و پلاردانی سووکانە پێشوازییان لێ کرد.

ئەو سوکایەتییە بەو کرا تا ئەو کات بە کەسی تر نەکرابوو، لە حەشمەتدا لە پێش خۆیدا نەما و بە شیرەکەی خەڵکەکەی لە خۆی دوور دەخستنەوە، لەو هەڵوێستەدا حەیران و سەرگەردان بوو نەیدەزانی چی بکات، پێی نەکرا لەو کاتەدا چاوی بە شاژن بکەوێ، پێشی نەدەکرا داوای نیشانە سپییەکەی خۆی بکات و بیسەلمێنێ کە لێی دزراوە، چونکە ئەگەر وای بکردایە نهێنییەکانی شاژن ئاشکرا دەبوون.

ئیدی تووڕەیی و ئازاری دڵ و دڵەڕاوکێ لەسەری کەلەکەیان کرد، دوای ئەو رووداوە، لە رۆخی رووباری فوراتدا پیاسەی دەکرد و خۆی دڵنیا دەکرد کە قەزا وای بۆ بڕیوەتە کەلە نەهامەتی و کلۆڵی رزگار بوونی بۆ نەبێ، ئەو کارەسات و رووداوانە کە بەسەریدا هاتبوون لەو ژنەیەوە کە پیاوی کوێری گەرەك نەبوو، تا ئەو شەوەی چەکی زۆرانبازییەکەی لێ دزرا سەر تاپا هەمووی دەهێنانەوە بەر چاوی خۆی، لەبەر خۆیەوە دەیووت ئەوە سووچی خۆم بوو چونکە چوومە ناو خەوە و درەنگ رابووم، خۆ ئەگەر کەمتر لەوەی کە نووستم بخەوتمایە، هەڵبەتە دەبووم بە پاشای بابل و مێردی ئەستارتیە، کەواتە زانین و رەوشت باشی و ئازایەتی منیان تووشی کوژرەوەری کردووە).

زمانی دژ بە توانای خوایی بەلای خراپەدا ترازا و وتی: (دیارە جیهان لە ژێر بارێکی قورسی قەزادایە) بێ بەزەییانە و، بەبێ رەحمانە ستەم لە داناییان دەکات کەچی گەرمەسێر بۆ سوارانی سەوزە پۆش ئامادە دەکات، ئەوەی زۆر باری گران کردبوو، ئەو نیشانە سەوزە بوو بەهۆی ئەوەوە تووشی ئەو سووکایەتییە بوو، لە رۆخی رووباری فوراتدا پیاسەی دەکرد تووشی هەندێ شتفرۆشان بوو، زرێ و نیشانەکەی بە نرخەکەیان هەرزان پێ فرۆشتن، بە نرخەیان جل و کلاوقوچکەیەکی کڕی.

بەو جلانەوە بە کەناری ئەو رووبارەدا کە پیاسەی دەکرد گلەیی ناراستەی توانای یەزدانی دەکرد کە ستەمی لێ کردووە.

زەدیج بەدەم پیاسە کردنەوە لەخۆی رامابوو، دی پیرێك ریشی سپی بەرداوەتەوە تا دەگەیشتە بەر کەمەری، کتێبێکی بە دەستەوەیە بە بایخەوە لێی ورد دەبێتەوە و دەیخوێنێتەوە، زەدیج لەبەردەمیدا راوەستا و بەرێزەوە سلاوی لێ کرد و کرنووشی بۆ برد، پیرەش بە نموود و شکۆمەندییەوە وەلامی سەلامەکەی دایەوە، زەدیج ئارەزووی کرد لە گەلێدا ئاخافتن بکات، پرسیاری لێ کرد! ئەوە چ کتێبێکە تەماشای دەکەیت؟

پیرەکە وتی: ((ئەوە کتێبی قەزایە، دەتەوێ شتێکی لێ بخوێنیتەوە؟. وای وت و کتێبەکەی دایە دەست زەدیج، ئەویش کە تەماشای کرد لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ زمانی دەزانین یەك پیتی پێ نەخوێنرایەوە، ئەوە وای لێ کرد فرەتر ئارەزووی بۆ زانینی ئەو کتێبەی بکرێتەوە. پیرە ریش سپییەکە وتی: ((لە وێناتدا خەم و کلۆلی بەدی دەکەم!)).

زەدیج وەلامی دایەوە: (ئاخ، ئەگەر ناو هەناوم بکەیتەوە ئەوجا دەزانی بۆ خەمبارم).

پیرەکە وتی: ((دەکرێ ببم بە هاورێت، ئومێدە سوودم لێ ببینی، گەلێ جار توانیومە خۆشی بخەمە ناو دڵی کلۆلانەوە)). زەدیج لە ناخەوە هەستی بەرێز و شکۆداری ئەو پیرە و ریشی و کتێبەکەی دەکرد، لەناو وتەکانیدا رووناکی دەدرەوشایەوە، کە باسی پرسی: قەزا، داد، رەوشت، چاکە و خراپە، بێدەسەلاتی مرۆڤی دەکرد بە شێوەیەکی رەوان و کاریگەرانەی وەها باسی دەکردن، وەکو سیحرێکی بە توانا زەدیجیان بۆ لای خۆی رادەکێشا، بۆیە زەدیج تکای لێ کرد کە تا دەگانە بابل لێی جیا نەبێتەوە. پیاوە پیرەکە وتی: ((منیش وام دەوێ، بەلام دەبێ سوێندم بۆ بخۆی بە (ئەهرۆمەزدا) چیم کرد لێم جیا نەبێتەوە. زەدیج سوێندی خواردوو پێکەوە کەوتنە رێ.

ئێوارە داهات رێیان کەوتە کۆشکێکی بلند و رازاوە، پیاوە پیرەکە داوای میوانداری بۆخۆی و زەدیج کرد، دەرگاوانەکە کە نیشانەی سەلاری و نەجیبی پێوە دیاربوو دەرگای بۆ کردنەوە، شوێنی خواردن و ژووری خاوەن کۆشکەکەی پیشان دان وهەردووکیانی بە سەرۆکی خزمەتکارەکان ناساند، ئەوجا داوای لێکردن بچنە سەر خوانی خواردن، لە

کەنارێکی خوانەکەدا دانیشتن، خواردنی خۆیان وەکو هەر میوانێکی دیکە خوارد، خزمەتکارەکان رووی خۆش و میهرەبانی و دەهەندیی خۆیان بۆ نواندن، ئەوجا تەشتێکی زێرینی بەیاقوت و زومرود رازاوەی بۆ هێنان، بۆ ئەوەی دەستی تیا بشۆن، ئەوجا برانە ناو ژوورێك بۆ ئەوەی ئەو شەوە لەوێ شەو بەرۆژ بکەنەوە، کە بەیانی هات یەکێك لە خزمەتکارەکە هاتە لایان بەهەریەکێکیان پارچە زێرێکی پێ دان و بەرێی کردن، لە کۆشکەکە هاتنە دەرەوە بەبێ ئەوەی خاوەن کۆشکەکە بێت بەلا چاوێك بیابینێ.

رێیان گرتە بەر، بەدەم رێوە زەدیج وتی: ((پێم وایە خاوەنی ئەو کۆشکە هەرچەند پیاوێکی بە فیز و خۆبەزالزان بوو پیاوێکی بەخەندە و نان بدە بوو هەرجۆرێ میوان راگربوو)).

کەوای دەووت دی گیرفانی کابرای پیرە ناوساوە و شتێکی قەبەی تیایە، کەلێی ورد بووەوە دی ئەوە ئەو تەشتە زێرە بە یاقوت و رازاوەیە کە ئێوارە دەستیان تیا شوشت، دزیوەتی، لە پێشەوە نەیوێرا دەنگ بکات، بەلام سەری سوڕما و دڵتەنگ بوو.

تا نیوەرۆی ئەو رۆژە رۆیشتن، تووشی خانووێکی بچووك بوون، خانووی پیاوێکی دەوڵەمەندی رژدبوو، پیاوە پیرەکە بۆ چەند ساتێکی حەواندنەوە داوای میوانداری کرد، خزمەتکارێکی پیری چلکن و قژ گرواژە پێشوازییەکی سارد و سڕی لێ کردن، بۆ حەواندنەوە بردینە ناو گەورێکی تاریکەوە، هەندێ زەیتونی گەنیو و کەمێ نانی رەق و خواردنەوەیەکی ترشاوی لە بەردەم دانان. پیاوە پیرەکە بەتام و چێژێکی وەهاوە خواردنی خۆی خوارد، وەکو خوارنەکەی شەوی رابردوو بەدڵ و رەزامەندییەوە خواردی، خزمەتکارەکەش بە دیاریانەوە راوەستابوو چاودێری دەکردن نەبادا شتێ بدزن، ئەگەر شتێکیان دزی زوو بیانکاتە دەرەوە، ئەو دوو زێرەی کە ئەم بەیانییە وەری گرتبوون کردنیە ناو دەستی کابرای خزمەتکارەوە و سوپاسی میوانداریەکەی کرد، ئەوجا رووی کردە خزمەتکتارەکە و پێی وت: ((تکات لێ دەکەم دەرفەتمان بدە دوو قسە لەگەڵ گەورە و سەروەرت بکەم)) کابرای خزمەتکار بەسەرسوڕمانەوە هەردووکی کردە ژوورەوە، پیاوە پیرەکە رووی کردە خاوەن ماڵەکە و وتی: ((ئەی گەورەم سەروەرم بێلافم لە حزووری تۆدا و

کرۆنشت بۆ دەبەم، دەرفەتم بدە سوپاسی ئەو دەهەندی میوانداریـیەت بکەم، بفەرموون ئەم تەشتە زێرم لێ وەربگرن بۆ ئەوەی ببێت بە یادگـاری ئـەو چـاکە و میهرەبانییـەت))، کـە ئەوەی وت و تەشتەکەی بـە دیـاری دایـە کـابرای رژدە. ئـەویش کـە بریـسکەی تەشـتە زێڕەکەی دی لە خۆشیدا لە هۆش خۆی چوو، بەڵام پیاوە پیرەکـە گـوێی بـە سەرسـامی و بێهۆشبوونی کابرا نەدا و تەشتەکەی خستە بەر دەستی و هاوڕێکەی خستە شوێن خـۆی و هاتنە دەرەوە. زەدیج لەکاری هاوڵە پیرەکەی سەری سوڕما و وتـی: ((بـاوە.. مـن شـتی سەیر لە تۆوە دەبینم، تۆ وەکو خەڵکانی تر نیت، تەشتی زێـر لـە مـاڵی پیـاوی خانـەدان دەدزی و دەیدەی بە کابرایەکی رژدی چاوچنۆکی وەها کە بە سووکییەوە میوانداری کردین!)). پیری ریش سپی هاتـەدەم و وتـی: ((کـوڕم بزانـە: ئـەو پیـاوە سـەلارە وە نـەبێ لـە خانەدانی خۆیەوە پێشوازی میوانان بکات بۆیە وا دەکا تا خەڵك بڵێن: بەخوا پیاوێکی نان بدە و خانەدانە و خۆی پیشان دەدا لەو رۆژەوە ژیر دەبێ و بە خۆیدا دەچـێتەوە ئـەو پیـاوە رژدە چلووکەش لەمەودوا فێر دەبێ و دەزانێ کە دەبێ چلۆن مێوانـداری بکـات، سەرسـام مەبە و پاشم کەوە.)).

زەدیج ئەم هەڵوێستە سەرگەردانی کـرد، نەیـدەزانی هـاوڕێی گـەورەترین شـێتە یـان هاوڕێی پایەدارترین فەیلە سووفە؟ ئەوەندە هەبوو کابرای پیرە پڕ بەدڵ و متمانەوە، قسەی بۆ دەکرد، زەدیج سوێندی بۆ خواردبوو کەلێی جیا نەبێتەوە، بەرێی خۆیاندا چوون، بـەرەو ئێوارە رێـیان کەوتە خانووێکی جوان، خانووەکە بە دیوی دەرەوەیدا دیاربوو نە لـە خـانووی پیاوێکی دەسبڵاو دەچوو، نەلە خانووی کەسێکی رژد، خاوەن خانووەکە فەیلەسـووفێك بـوو خۆی لە خەڵك دوور خستبووە وە بۆ ئەوەی خەریکی حیکمەت زانـی و دانـایی بـێ، لـەو چۆڵەوارییەدا نە بێزار دەبوو نە هەسـتی بە دڵتەنگی دەکرد، حەزی لـەوەبوو لـەو شـوێنەدا مێوانداری رێبواران بکات، نە لەبەر ئەوە بوو خۆی بەزل بزانێ، نە لەبەر ئـەوەش بـوو لـە خۆی بایی بووبێ، کە ئەو دوو مێوانەی دی، بـەرووێکی گـەش بـە دەمیانـەوە چـوو، بـۆ حەوانەوە هەردووکیانی بردە ناو ژوورێکی راخراوە وە، دوای ماوەیەك چووە لایـان بـۆ نـان خواردن بردینە سەر خوانێکی پاك و رازاوە، لەبارەی ئـەو گێـچەڵ و شۆڕشـانەوە کـە لـەو

دواییەدا ولاتی بابلیان شلەژاند بوو بە ترێسەوە قسەی بۆ دەکردن، بە وتەکانیدا دیاربوو کەسێکی دڵسۆز و خەملەبەری ولاتی بابلە، ئاواتی بوو یەکێکی وەکو زەدیج بەشداری لەو زۆرانبازییەی دواییەدا بکردایە بۆ ئەوەی ببێ بەشای بابل، لە دوییدا وتی: لێیان گەڕێ ئەو مەردوومە شایەنی ئەوە نین یەکێکی وەك زەدیج ببێ بە پاشایان)).

زەدیج کە گوێی لەو قسەیە بوو لە شەرمدا روومەتی سوور هەڵگەڕا و برینەکانی کولانەوە، هەر لەو جڤاتەدا قسەی دیکە کران، هەرسێ لەسەر ئەو رایەبوون کە ئەوەی لە گەردووندا روو دەدات، بە دڵی ئەهلی حیکمەت روونادا، پیاوە پیرەکەش دەیووت وە نەبێ خەڵك لەویست و خواستی یەزدان ئاگادارین، کە حوکمیش بەسەر شتەکاندا دەدەن بە هەڵە حوکم دەدەن، وەنەبێ هەموو شتێ بزانن، ئەوجا قسە چووە سەرچڵێسی، زەدیج وتی: (ئای چڵێسی چەند مەگێزێکی سامناکە)).

پیرەکە وتی چڵێسی وەکو ئەو بایە وایە کە چارۆکەی پاپۆر دەکاتەوە، هەندێ جاریش دەبێتە هۆی نوقم بوونی پاپۆرەکە، لەگەڵ ئەوەشدا پاپۆر بێ ئەو ناتوانێ لە شوێن خۆیدا بجوولێ، تۆ سەیرکە دڵتەنگی دەبێتە هۆی تووڕە بوونی مرۆڤ، جاری واش هەیە تووشی دەغزی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ ناتوانێ بێ لەو بژی، هەموو شتێ لەسەر ئەم زەوییە بوونی بۆ مرۆڤ هەم خەتەرە هەم زەرووریيە و دەشێ ببێ. قسە گەیشتە سەرپرسی چێژ: پیاوە پیرەکە سەلماندی کە چێژ خەلاتی خوایە، ئەو وتی: (هەست و بیری مرۆڤ لە چێژ و ئازارەوە دەکەونە کار، هەروەها وتی کەسیەتی مرۆڤ لە دیدی ئازارەکانیەوە دێتە دی).

زەدیج لەو هاورێیەی خۆی سەری سوڕمابوو، ئەو ئیشە ناشرینانەی کرد و ئەو پەندە پڕ بە حیکمەتانەش دەزانێ، کە دەمەتەقێی ئەو شەونشینییە تەواو بوو، خانە خوێکە هەردووکی تا دەمی ژووری نووستنەکەیان رەوانە کردن و سوپاسی خوای کرد کە ئەو شەوە دوو پیاوی دانا و زانای وەهای کردنە مێوانی، بە شێوەیەکی میهرەبانی و نەزاکەت، بەبێ ئەوەی هەستیان بروشکێنێ هەریەك بڕێ خەرجی دانێ، پیاوە پیرەکە بە نەوازشەوە خواحافیزی لە خانە خوێکەی کرد و وای تێگەیاند کە بەیانی بەر لە هەڵهاتنی خۆر بەرەو بابل دەکەونە رێ، دابڕانەکەیان لەسەر خۆ و پڕ نەزاکەت بوو، زەدیج لەناخەوە هەستی

بەرێزداری و پیاوچاکی ئەو خانە خوێیانەی دەکرد، کە پیاوە پیرەکە و زەدیج چوونەوە ناو ژووری خەوتنەکەیان پێکەوە گەلێ سوپاس و ستایشی ئەو پیاوەیان لەسەر ئەو مێوانداریییەی کرد.

لە نیوەی شەو دابوو پیاوەپیرەکە زەدیجی ئاگادارکردووە کە ئامادەی ڕۆیشتن بێ، وتی ((بەرلەوەی بەیانی خەڵك لەخەو رابن دەبێ، پەندێك لەپاش خۆمان بۆ ئەو پیاوە پاك و دڵسۆزە بەجێی بێڵم)) وای وت و چرایەکی بە دەستەوە گرت و ئاگری بەردایە خانووەکە! زەدیج تەزووی سەرسامبوون وای راچڵەکان، هاواری کرد: ئەوە بۆ وادەکەی! ویستی نەهێڵێ ئەو کارە قێزەونە بکات، بەلاّم کابرای پیرە زەدیجی بە هێزێکی وا بە شوێن خۆیدا راکێشا، لەتوانای کەسدا نەبوو خۆی لەبەریدا رابگرێت، زەدیجی بە دوای خۆیدا رادەکێشا، لەوکاتەدا خانووەکە لەناو کڵپەی ئاگردا دەتوایەوە، کابرای پیرە لە دوورەوە بە ئاستەم و ئاسایی سەیری بڵیسەی ئاگرەکەی دەکرد و دەیووت: (سوپاس بۆ خوا ئەوەتا خانووی خانە خوێکەم ئاگر قوتی دا ! ئای ئەو پیاوە چەند بەختیار بوو!).

کە زەدیج ئەو رووداوەی دی و گوێی لەو وتەیە بوو، ویستی پێکەنینێکی فرمێسکاوی پڕ لەحەسرەت بکات و، لە پیرە بدات و بە دژوێن بیشواتەوە و لێی جیا بێتەوە، لەبەرئەوەی کەوتبووە ژێر بارێکی قورسی جاویدا نییەوە نەیتوانی وا بکات، ناچار بەدوای کەوت تابزانێ سەری لە کوێوە دەردەچێ، ڕۆیشتن تارێیان کەوتە ماڵی بێوەژنێکی چاکەکار و بەرێز کوڕێکی چواردە ساڵەی جوان و ڕۆح سووکی خزمی لەگەڵیدا دەژیا، ئەو کوڕە تاکە ئومێدی ئەو بێوەژنە بوو، بێوە ژنەکە تابڵێی بە جوانی میوانداری کردن کە بەیانی کاتی ڕۆیشتنیان هات، بێوەژنەکە داوای لەکوڕەکە کرد تا سەر پردە شکاوەکە پێشیان بکەوێ، پەرینەوە بەسەر پردەکەدا خەتەرناك بوو شارەزایی دەویست، کوڕەکە بۆ ڕێنماییان پێشیان کەوت، کە گەیشتنە سەرپردەکە کابرای پیرە بەکوڕەکەی وت:

(داوەرە دەمەوێ پاداشتی چاکەی پوورەکەت بدەمەوە، کە کوڕەکە چووە بەردەمی پرچی سەری گرت و فڕێی دایە ناو ڕووبارەکەوە، منداڵەکە لەناو ئاوەکەدا هەندێ

هەڵبەزین و دابەزینی کرد، لەدواییدا لەناو ئاوەکەدا نقوم بوو، لەوێدا زەدیج خواینی ئەما و بەرووی کابرای پیرەدا هاواری کرد:

((ئەی دڕندەی تاوانبار، تا ئێستا کەسی تاوانباری وەکو تۆم نەدیوە). پیرەکە پێی وت تۆ سوێندت خوارد کە خواین لەسەر ئەو شتانە بکەی کە دەیانکەم، بزانە لە ژێر ئەو خانووەدا کە ویستی یەزدانی سووتاندی گەنجینەیەك هەبوو بە سووتاندنی بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە، ئەو مێر منداڵەش کە ویستی یەزدانی بەدەم ئاویادا ئەگەر بژیایە دوای ماوەیەك پوورەکەی خۆی دەکوشت، دوای دوو ساڵی دیکە تۆیشی دەکوشت.

زەدیج وتی: ((ئەی دڕندەی بێڕەحم تۆ ئەوە چۆن دەزانی، گریان لەناو کتێبەکەدا وانووسراوە، ئەی بە چ حەقێك تۆ منداڵی دەکوژی کە هیچ خراپەیەکی بۆت نەبووە؟)) لەو کاتەدا زەدیج ئەو قسانەی دەکرد و دی کابرای پیرە ریشە سپییەکەی نەما و روومەتی بوو بە روومەتی گەنجێکی نووارانی، جلە کاهێنییەکانیشی نەمان چوار باڵی گەورەی لێ روان.

زەدیج لەبەر پێیدا بە چۆکدا هات و وتی: ((ئەی پەیامبەری ئاسمان ئەی فریشتەی خوایی، کەواتە تۆ لە بڵندایی ئاسمانەکانەوە هاتووی بۆ ئەوەی مرۆڤی سەرگەدان فێر بکەی کەسەری بۆ قەدەری ئەمر دانەوێنی)).

ئەو پیرە فریشتە (جسراد) بوو وتی: (مرۆڤ بەبێ ئەوەی شت بزانێ دەم لەهەموو شتێ دەدات، تۆ لەهەموو کەس زیاتر پێویست بوو فێر ببی).

زەدیج داوای روخسەتی لێکرد قسە بکات، وتی: (من خۆم بە گوناحبار دەزانم، بەلام ئایا پێم دەکرێ پرسیارت لێ بکەم، بۆ ئەوەی پەردەی دڵم گەردی گومان نەگرێ، ئایا چاککردنی ئەو منداڵە لە خنکاندنەکەی چاکتر نەبوو)؟

جسراد وتی: (ئەگەر خەیری تیا بوایە و بژیایە و ژنی هاوردبایە، ئەوکات خۆی و ژنەکەی لەگەڵ منداڵەکانیدا دەکوژران).

زەدیج: (بۆ وا!؟ دیارە تاوان و کوێرەوەری بە باڵای مرۆڤدا بڕاون، بۆ دەبێ بەشی دانایان هەر کوێرەوەری بێ؟).

جسراد وتی: (کەسانی خراپەکار هەمیشە لە کوێرەوەریدان، ئەوانە دەردن کەسانی دانایان پێ تاقیدەکرێتەوە، ئەوەی شەڕە سەرچاوەی خەیرە.

زەدیج وتی: (چی دەبێ خەیر هەبێ و شەڕی لە تەکدا نەبێ).

جسراد وتی: (ئەوکات زەوی دەگۆڕدرا بە زەوییەکی دیکە، ڕووداوەکانیش لەسەر شێوەی حیکمەتێکی دیکە بە دوای یەکدا دەهاتن، ئەو شێوەیە حیکمەتێکی بالآیە کە تەنیا لە بارەگای یەزداندا هەیە کە خراپە نایگاتێ، خوا چەندەها گەردوونی ئەفراندوون کە هیچ کامێکیان لەوی دیکەیان ناچێت، ئەو جیاوازییە نیشانەی توانای بێسنووری یەزدانە، دوو گەلآ لەسەر ئەم زەوییە، دووگۆی خڕ لە ئاسماندا یەکێکیان لەوی دیکەیان ناچێت، هەرشتێ کە لە سەر ئەم گەردوونە بچکۆلەیە کە تۆی لەسەر لە دایکبووی، هەموو شتەکانی سەری بە تەرازووی خواستی یەزدانی سەنگ و کێش کراون، بەپێی قانوونی یەزدانی بەتوانا نەخشەیان بۆ کێشراوە، خەڵك وا دەزانن ئەو منداڵە کە بە ئاوەکە خنکا، بەرێکەوت کەوتووەتە ناو ئاو، یان پێیان وایە رێکەوت ئەو خانووەی سووتاند، کەچی رێکەوت هەبوونی نییە، هەموو شتێ لەبەردەم تاقیکردنەوە دایە، هەرشتێ تۆ وێنای بکەیت یان سزایە، یان پاداشتە یان لە بەردەستدایە، راوچییەکە بێنەوە بەرچاوت، وای دەزانی کەس وەك ئەو داماو نییە.

(ئەهرۆمەزدا) تۆی ناردە لای بۆ ئەوەی وا نەزانێ کلۆڵە، ئەی کەسی بێ توانای بە هیلاك چوو دەست لەکاری یەکێك تێوەر مەدە کە پێویستە بەندەگی بۆ بکرێ). زەدیج وتی: (بەلآم...) وشەی (بەلآم)ەکە لەدەم زەدیج دا تەواو نەبوو بوو، فریشتەکە بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە، زەدیج بەروودا کەوت و هەردوو دەستی بەندەگی و بڕوای بەرەو بارەگای (ئەهرۆمەزدا) بەرزکردنەوە. فریشتەکە لەشکەشانی ئاسمانەوە فەرمانی پێدا: ((بەرەو بابل بگەڕێتەوە)).

* * *

## مەتەڵ

زەدیج بێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ ڕێی بەرەو بابل گرتبووە بەرو، دەڕۆیشت وەکو یەکێك هەورە تریشقە گێژی کردبێ، لەو ڕۆژەدا کە هەموو بەشداربوانی زۆرانبازییەکە، لە دالانێکی گەورەی کۆشکێکدا بۆ تاقیکردنەوە و هەڵهێنانی مەتەڵەکان و وەلامدانەوەی کاهێنی گەورە ئامادە بووبوون، تەنیا سوارەی خاوەن نیشانەی سەوز دیارنەبوو.

کە زەدیج لەشاری بابلدا دەرکەوتەوە هەموو خەڵك دەورەیان لێدا و لە دیتنی تێر نەدەبوون، هەر بابا بوو مژدەی گەڕانەوەی زەدیجی بەوانیتر دەدا، هەموو لەدڵەوە ئاواتیان دەخواست ئەو ببێ بەشای بابل، کابرای ڕژدە کە چاوی پێکەوت ڕووی لێ وەچەرخان و ڕۆیی، ئەوجا خەڵك زەدیجیان لەسەر شان نا و بردیان بۆ شوێنی کۆبوونەوەی سوارەکان و شوێنی تاقیکردنەوەکە، هەواڵی گەڕانەوەی زەدیج بە گوێی شاژندا درا، ئەویش کەوتە نێوان ترس و ئومێدەوە، لەناخەوە تووشی گوشینی دڵەڕاوکێیەکی خەمناك بوو، نەیدەزانی بۆچی زەدیج بێ چەکە و ئیتۆیادیش نیشانە سپییەکەی ئەوی پۆشیوە، کە جەماوەر زەدیجیان دی ئامادەبوو، هەرا و هۆریای شادمانیان بەرزکردەوە، بەلام جگە لەو سوارانە کە بەدیتنی جەماوەر بەشدارییان لە زۆرانبازییەکەدا کردبوو نەیاندەهێشت کەسی تر بچێتە ئەو شوێنەی کە تاقیکردنەوەکەی تیا دەکرا.

زەدیج هاواری کرد و وتی: (لە زۆرانبازیدا وەکو ئەوانیتر بەشداریم کردووە، بەلام یەکێك لەناو بەشداربووەکاندایە چەکەکەی منی پۆشیوە، هەتا بەڕاستی ئەوەتان بۆ ئیسبات دەکەم، تکایە دەرفەتم بدەن کە بەشداری لە هەڵهێنانی مەتەڵەکاندا بکەم، کە زەدیج وای وت لە هەموو لایەك دەنگ بەرز بووەوە کە داخوازییەکەی

قەبوولّبکرێ، راستگۆیی و متمانە و نموودی زەدیج هەر لە زووەوە لە ناو دڵی خەڵکدا چەسپابوو، کاهێنی گەورە بەم پرسیارە دەستی بە تاقیکردنەوە کرد و وتی:

درێژترین وکورتترین و خێراترین و سسترین و توندترین شت کە توانای دابەشبوون و درێژبوونەوەی هەبێ، لەجیهاندا چییە؟. هەروەها ئەو شتە بە توندی بایەخی پێدەدرێ، بەتوندیش خەمی بۆ دەخورێ، بێ ئەویش هیچ شتێ دروست ناکرێ ئەوەی بچووکە لە بیری دەبات و ئەوەی گەورەیە لە یادی دەکات.. ئەمە چییە؟.

دەبوو لە پێشەوە ئیتۆباد وەلامبداتەوە، وتی من چیمە بەسەر مەتەڵ هەڵهێنانەوە من ئەوەندەم بەسە بەسەرە نێزەی خۆم سەرکەوتووم.

هەندێ لە بەشداربووەکانی تر وتیان مەتەڵ هەڵهێنان بە چەنسە هەندێ وتیان ئەو شتە زەوییە، هەندێکی تریان وتیان ئەوە رووناکییە، زەدیج وتی: ئەوە زەمانەیە، چونکە هیچ شتێ بە ئەندازەی ئەو درێژ نییە، چونکە پێوەری ئاواتەکانمان کورت دەکاتەوە، بۆ کەسی چاوەروان سسترین شتە، بۆ کەسی شادمان لەخۆی خێراتر نییە، هەتا هەتایە درێژەی هەیە بە سەرکورتترین شتدا کە چرکە ساتە دابەش دەبێ، هەموو خەڵك پشت گوێی دەخەن، هەمووشیان خەم بۆ بە دەست چوونی دەخۆن، هیچ شتێك لەدەرەوەی زەمەندا ناکرێ، ئەوەی شایستەی ئەمری ئەبی لە بیری دەکات، ئەمریش بەکاری گەورەوە یاد دەکات.

دەنگ لەهەمولا بەرز بووەوە کە زەدیج هەڵیهێنا.

کاهینەکە پرسیارێکی تری ئاراستەی سوارەکان کرد و وتی: (ئەوە چییە دەبەخشرێ و سوپاسی لەسەرناکرێ، بەهرەیەکە بە مرۆڤ دەدرێ بەبێ ئەوەی بزانێ چۆن پێی دراوە، بە مەردوومی دەبەخشێ بێ ئەوەی بزانن چۆن بەخشراوە، لەدەست مرۆڤ دەردەچێ بێ ئەوەی دەسەلاتی تیا هەبێ؟

هەریەکێ شتێکی وت.

زەدیج وتی: ئەو ژیانە، هەموو مەتەڵ و معماکانی بەو ئاسانییە هەڵهێنان.

ئیتۆیاد دەیووت: جا شت هەیە لە هەڵهێنانی ئەو مەتەڵانە ئاسانتربێ، ئەگەر بیویستایە بە ئاسانی وەلامی دەدانەوە. چەند پرسیارێکی دیکە سەبارەت بەداد و چاکەی باڵا و هونەری حوکمرانی کران، وەلامەکانی زەدیج راستترین وەلام بوون، گوێی لێ دەبوو هەندێ کەس دەیانووت مەخابن خاوەنی ئەو مێشکە و ئەو زانایە سوارێکی تەواو نییە.

زەدیج وتی: (بەرێزەکان! من لە مەیدانی زۆرانبازیدا براوە بووم، نیشانە سپییەکە من بووم، لەکاتی نووستنمدا بەرێز ئیتۆیاد بردوویەتی، لەوانەیە وای زانیبێ ئەو نیشانە سپییە بەو دەکەوێ تا نیشانە سەوزەکەی خۆی، من ئامادەم بەبەر چاوتانەوە بەم جلەی خۆم و بەو تەنیا شیرەی خۆم لەوەوە دڵنیاتان بکەم کە خاوەنی نیشانە سپییەکە من بووم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە هەموو چەك نیشانە سپییەکەی کە دزی ئامادەم بۆتان بسەلمێنم، بەرێزان لەوەش دڵنیاتان دەکەم ئەوەی بەسەر ئەمیر (ئۆتام) دا سەرکەوت ئەوە من بووم).

ئیتۆیاد هەرەشەکەی (زەدیج)ی قەبوولکرد، چونکە لە خۆی دڵنیابوو بەو چەشنە بەسەریدا سەر دەکەوێ، ئەو بەو زرێ پۆشی و قەڵغان و تاسکڵاوە و شیرەوە، ئەویش لە تۆی کراسێك و شیرێکەوە بێگومان بەسەریدا سەر دەکەوێ. زەدیج شیرەکەی هەڵکێشا و دروشمی (بژی شاژن)ی راگەیاند، شاژن بۆی دەروانی و لەناوەوە لە نێوان خۆشی و ترسدا دەکولا، (ئیتۆیاد) شیرەکەی هەڵکێشا، نیکلامی بۆ شاژن نەکرد. بەبێ بایخانە بۆ زەدیج چووە پێشەوە، یەکەجار شیرەکەی ئاراستەی تەپڵی سەری زەدیج کرد، لای وابوو بە یەکەم ـان سەری دەکات بە دوو لەتەوە، کەچی زەدیج بە ئاسانی شیرەکەی لادا بە کارێکی وەها بوو شیرەکەی ئیتۆیاد بوو بە دوو کەرتەوە، لەو کاتەدا زەدیج وەك پڵنگ هێرشی بردە سەری و، دوو لاقی گرت و لەگەڵ زەویدا تەختی کرد، ئەوجا نووکی شیرەکەی لە کونی زرێکەیەوە خستە سەر دڵی و پێی وت:

(لێم گەرێ چەکت بکەم دەنا دەتکوژم). ئیتۆیاد خۆی بە چارەرەش دەزانی و دەنا چۆن کەسێکی بێ چەك دەتوانێ چەکی بکات!.

زەدیج یەکەم تاسکلاوەکەی لەسەر کردەوە، ئەوجا زرێکەی و قەڵغانەکەی هەمووی لەبەرکردن و بە نیشانەکەی خۆیەوە چووە بەردەم شاژن ئەستارتیە و ئیکلامی بۆ کرد.

کادۆر توانی بەئاسانی بۆ خەڵکەکە بسەلمێنێ کە نیشانە سپییەکە لە سەرەتاوە نیشانەی زەدیج بووە، لەوکاتەدا خەڵکەکە بەیەك دەنگ بانگەوازییان بە بوونی زەدیج بەشای بابل بەرزکردەوە، بە تایبەتی ئەستارتیە، دوای ئەو هەموو نەهامەتییانەی بەسەری داهات ئەوەتا بە دڵدارەکەی خۆی شاد بووە وە، کەڕای هەموان وابوو زەدیج شایەنی ئەوەیە ببێتە هاوسەری.

ئیتۆیاد گەڕایەوە ناو کۆشکەکەی خۆی کە خزمەتکارەکانی بەسەروەر ناویان دەهێنا، (زەدیج)یش چقەی شاهانەی لەسەرنرا و بەختەوەر بوو، دەنگی فریشتە (جسراد) کە پێی وتبوو: (دەنکە بەردێکی ناو سارای لم بووە بەدرێك) لەناو مێشکیدا دەزرنگایەوە، زەدیج و شاژن سوپاسی (ئەهرۆمەزدا)یان کرد لەسەر ئەو گەورەییە کە بۆی رەخساندن.

زەدیج ژنە تووشە جوانەکە (میسووف) ی بەرەڵلا کرد کەبە نارەزووی خۆی بەسەر زەویدا بسووڕێتەوە، ناردی بەشوێن کابرای رێگردا (ئەربۆجاد) پایەیەکی بەرزی لەناو لەشکر پێ بەخشی و پەیمانیشی دایە ئەگەر رەوشتی سەربازێکی شەریف بگرێتە بەر پایەی بەرزتریکاتەوە، بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە سەربڵحە کۆنەکانی لە سێدارەی بدات.

پیاوی بەشوێن سیتۆك و ئەلەمۆنای جواندا بۆناو قووڵایی عەرەبستان نارد، کە هات کردی بە سەرداری بازرگانەکانی بابل، پاداشتی (کادۆر)ی برادەری بە جۆرێك دایەوە لەگەڵ راستگۆیی و وەفاداریدا هاوجووت بن، کردی بە نزیکترین هەڤاڵی شا. زەدیج لە ناو پاشاکانی ئەو سەردەمەدا بەوە ناسرابووکە هەڤالێکی راستگۆی وەك کادۆری هەیە، پیاوە کورتیلە لالەکەشی لەبیر نەچوو، خانووێکی جوانی بەکابرای راوچی بەخشی، فەرمانی دا (ئۆرکان) ئەو خانووەی ئەو ژنەی کەلێی داگیرکردبوو

بیداتەوە، بەلاّم راوچییەکە ببوو بە فەیلەسووف، جگە لە خانووە زەوتکراوەکەی هیچی تری نەویستەوە.

پەریزاد شەرمەزاریێکی زۆر دایگرت و خۆی بە خەجالەت دەزانی ئەوە بوو کە زانی زەدیج کوێر بووە، حەزی لە پیاوی کوێر نەکرد. (ئازۆرا)ش کە پەشیمانی خۆی کردبووە گریان، ئەوەبوو رۆژێك لەرۆژان ویستی بۆ یارەکەی لووتی ببڕێ، زەدیج بە دیاری ناردن بۆ هەردووکیان ئازارە دەروونییەکانیانی سووك کرد، کابرای رژدەش لە داخدا ناو هەناوی بۆ گەن بوو، لە خەمدا مرد.

دەولەتی بابل لەسایەی ئارامی و شکۆمەندی خۆشگوزەرانیدا لەو سەردەمەدا گەشایەوە، کە ئەو سەردەمە بە باشترین سەردەمی ئەو کاتەی سەر زەوی ناسرا، چونکە خۆشەویستی و دادەوەری حوکمڕانییان دەکرد، خەلکی ولاّت هەموو سوپاسی زەدیجیان دەکرد، زەدیجیش ستایشی خواکانی کرد.

حەمە کەریم هەورامی
٣٠ / ٣/ ٢٠١٠
هەولێر



هەر چەندە سەنتەری زەمینی چیرۆکەکە شاری بابلی دووهەزار سالی بەر لەزانینە، ئەوەی فەزاکەی فرەتر خەیاڵاوی کردووە وەك یەکێك لە چیرۆکەکانی هەزارو یەکشەوە، ئەوشتانە هەموو کراون بە بازیبەندێکی پڕ بەهاو گەردانە زێڕین لەقۆڵو گەردنی خۆشەویستی راستەقینە کراون. پێ دەچێ لەپاڵ ئەو هۆیانەشدا هۆیەکی دیکەش کاری خۆی کردبێ کەبوونی یەکێك لەو دوو دلدارە سەرەکییەی ناو چیرۆکەکەبێ، کە ئەو شاژنەیە کەناوی (ئەستارتیە)یە، دوورنییە ئەو شاژنە بابلیە ئەو شاژنە نەبێ کەشای بابل باخچەی هەڵواسراوی بۆ دروستکرد، کە ناوی (ستارە)بووە، وەکو مێژوونووسان بۆی دەچن خەڵکی ناو شاخ‌و چیاکانی کوردستان بووە






وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی
رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

٢٠١١

چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری